زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست
( ٣٤ )

# پوختەیەک لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی

نووسینی : شێخ محمدصالح العثیمین

وەرگێڕانی: مامۆستا محمد عبدالرحمن لطیف
وتار خوێنی مزگەوتی (عەلی کوڕی ئەبوطالب)

چاپی سێیەم
١٤٣١کۆچی

ـەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست

( ٣٤ )

# پوختەیەك

# لە

# ـیروباوەڕی ئیسلامەتی

(نبذة في العقيدة الإسلامية)

نووسینی : شێخ محمد صالح العثیمین

وەرگێڕانی : مامۆستا محمد عبد الرحمن لطیف

وتارخوێنی مزگەوتی (شێخ إبراهیم) / کەلار

چاپی چوارەم

١٤٣١ کۆچی

**ناوی کتێب** : **پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی**

**ناوی نووسەر** : **شێخ محمد صالح العثیمین .**

**ناوی وەرگێڕ** : مــحمد عبد الرحمن لطیف .

**ژمارەی سپاردن** : **ژمـارە ( ٢٤٦)ی سـاڵی (٢٠٠٢) پـێ دراوە لـە ـەن**

**وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .**

**زنجیرە** : زنجیرەی (٣٤) سی و چوارەم لە زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست .

**نۆرە و ساڵی چاپ** : چوارەم ـ (١٤٣١ هـ / ٢٠١٠) .

**چاپ خانە** : چاپەمەنی زانا / سلێمانی .

**بنکەی بڵاوکردنەوە** : **کتێبخانەی سوننە ــ سلێمانی .**

**کتێبخانەی پێشین ــ هەولێر .**

**کتێبخانەی زانستی بەسوود ــ کەلار .**

**کتێبخانەی سیما ــ چەمچەماڵ .**

**لە بڵاوکراوەکانی**

**کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار**

قال الإمام الشافعي رحمهُ الله :

كُلُّ العُلومِ سِوَى القُرآنِ مَشغَلَة ‏ ‏ ‏ إلاَّ الـحَدِيثَ وإلاَّ الفقـه في الدِّينِ

العِلمُ ما كانَ فيهِ قال حَدَّثَنـا ‏ ‏ ‏ وما سِوَى ذَاكَ وسواسُ الشَّياطيـنِ



## پێشەکی وەرگێڕ

خوێنەری بەڕێز : ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بریتی‌یە لە هەندێك زانیاری سەرەتایی زۆر گرنگ سەبارەت بە (بیروباوەڕی ڕاستی ئیسلام : بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە) کە بە بەڵگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتڕاستکراونەتەوە بە شێوازێکی زۆر پوخت و ئاسان .

بۆیە بە پێویستم زانی وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی ببێت بە دەروازەیەك بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ئاشنا ببن بە بابەتەکانی بیروباوەڕی ڕەسەنی ئیسلامەتی کە بە هۆی لادان و چەواشەکاری و لاسایی کردنەوەی کوێرانە و بێئاگایی زۆرێك لە خەڵك غەریب و نامۆ بووە لە نێو کۆمەڵگای موسڵمانانەدا بە گشتی !

وە بە باشی دەزانم لەم پێشەکی‌یەدا سێ خاڵت بۆ ڕوونبکەمەوە :

**یەکەم** : پێناسەی بیروباوەڕ (**العقيدة**) کە بریتی‌یە لە :

زانیاری بە حوکمە شەرعی‌یە گرێدراوەکان لە دڵدا کە وەرگیراون لە قورئان و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بە تێگەیشتنی سەلەفی صالح .. وەك باوەڕبوون بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی و بە قەدەر خێر و شەڕی ، هەروەها باوەڕبوون بە هەموو بوارەکانی غەیب .. و ڕەتکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی بیدعە و شوبهات و بیروباوەڕە پووچەڵەکان .

کەواتە بیروباوەڕ ـ لای ئەهلی سوننە ـ بەو زانیاری‌یە ڕاستانە دەوترێت کە لە دڵدا جێگیربوون و دڵی لە سەر گرێدراوە و قەبوڵی گومان ناکەن .

**دووەم** : سەرچاوەی وەرگرتنی بیروباوەڕ کە بریتی‌یە لە :

ئایەتـەکانی قورئـان و فـەرمووده صـەحیحەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) بـە تێگەیشتنی سەلەفـی صالح و پێشەوایانی ئوممەت .

ئەمەیە سەرچاوەی وەرگرتنی بیروباوەڕی ڕاست و ڕەسەنی ئیسلامەتی ، جا هەر کەسێك لە هەر کات و شوێنێك بێت بیروباوەڕی لەم سەرچاوەیەوە وەرنـەگرێت ئـەوا دووچـاری لادان (انـحراف) و گومڕابـوون (ضَـلال) و تیاچوون (هَلاك) دەبێت ، پەنا بە خوا .

**سێیەم** : هەر زانیارییەك کە لە پەراوێزی ئەم کتێبـەدا نووسـراوە ئـەوە لە لایەن وەرگێڕەوەیە بە مەبەستی ڕوونکردنەوە و زانیاری زیاتر بۆ خوێنـەر خراونەتە سەری .

داواکارم لە خـوای پـەروەردگار لـە سـەر بیروبـاوەڕی ڕاسـت و دروسـتی ئیسلام دامەزراومان بکات تاوەکو مردن و پاشان لە سەری حەشـرمان بکـات لە گەڵ پێغەمبەران و پیاوچاکان و پێشەوایانی ئوممەت و زانایـانی ڕەسـەنی ئیسلام ...

وەرگێڕ :
**محمد عبد الرحمن لطيف**
**کوردستان / کەلار**
(٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣)



**پێشەکی دانەر :**

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَتُوبُ إِلَيْهِ ، وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ .
وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ ، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلـــهِ وَأَصْحَابِهِ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحسَانٍ وَسَلَّمَ تَسْلِمَاً .
أَمَّا بَعْدُ :

بەڕاستی **(زانستی یەکخواپەرستی / علم التوحید)** بەڕێزترینی زانستەکانە و لە هەمووشیان پایەدارترە و فێربوون و گەڕان بەدوایدا لە زانستەکانی تر پێویست و واجب ترە ، چونکە **(زانستی یەکخواپەرستی)** بریتی‌یە لە بوونی زانیاری بە خوای گەورە و ناو و سیفەتەکانی و مافەکانی بە سەر بەندەکانیەوە ، وە کلیلی ڕێگای بەرەو لای خوا چوونە ، وە بنچینە و بنەوای شەریعەتەکانیەتی .

لە بەر ئەمە هەموو پێغەمبەران کۆبوون لە سەر بانگەوازکردن بۆ **(یەکخواپەرستی / التوحید)** ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾ [سورة الأنبياء] .

واتە : هیچ پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆ نە ناردووە ئیللا وەحیمان بۆ ناردووە کەوا هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە من نەبێت بۆیە تەنها من بپەرستن .

وە خوای پایەبەرز شایەتی داوە بە تاك و تەنهایی خۆی ، هەروەها فریشتەکانی و زانایانیشی کردووە بە شاهید لە سەر ئەمە ، خوای گەورە

فەرموویەتی : ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ [آل عمران] .

واتە : خوا شایەتی داوە بەوەی کەوا هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت هەروەها فریشتەکان و زانایانیش شایەتیەکی ڕاوەستاو لە سەر دادپەروەریان داوە ، هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت خوا دەسەڵاتدار و دانایە .

جا لە بەر ئەوەی پلە و بایەخی (**یەکخواپەرستی**) ئاوەهایە پێویستە لە سەر هەموو موسڵمانێك کەوا گرنگی و بایەخی پێبدات بە فێربوونی و فێرکردنی و تێفکران تێیدا و باوەڕ پێبوونی بۆ ئەوەی دین و ئاینەکەی بنیات بنێت لە سەر بنەمایەکی ڕاست و دڵنیا و ئارام و ملکەچبوون ، وە بەختەوەر و دڵشاد بێت بە بەروبووم و دەرئەنجامەکانی .

دانەر

# ئاینی ئیسلام

**ئاینی ئیسلام** : ئەو ئاینەیە کەوا خوا پێغەمبەر (موحەمەدی ﷺ) پێ ناردووە ، و هەموو ئاینەکانی پێ کۆتایی هێناوە ، و کاملی کردووە بۆ بەندەکانی و نیعمەتی خۆیی پێ تەواو کردووە بە سەریاندا ، ڕازیش بووە ببێت بە ئاینیان ، وە لە هیچ کەسێك هیچ ئاینێکی تر قەبوڵ ناکات جگە لە ئاینی ئیسلام نەبێت .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ [الأحزاب] .

واتە : موحەمەد باوکی هیچ یەکێك لە پیاوانی ئێوە نەبووە بەڵکو پێغەمبەری خوایە و کۆتاهێنەری پێغەمبەرانە ، و خوا زانیاری بە هەموو شتێك هەیە .

وە فەرموویەتی : ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : ئەمڕۆ من دینەکەتانم بۆ کامڵ کرد و نیعمەتی خۆمم بە تەواوی دابەسەرتانا و بە ئیسلامیش ڕازی بووم ببێت بە دین و ئاینتان .

وە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ ﴿١٩﴾ ﴾ [آل عمران] .

واتە : بەڕاستی ئاین لە لای خوا بریتییە لە ئیسلام .

وە فەرموویەتی : ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ [آل عمران] .

واتە : هەر کەسێك بەدوای هەر ئاینێکی تردا بگەڕێت جگە لە ئیسلام

ئـەوا لێـی قـەبوڵ ناكرێـت و ئـەو كەسـەش لـە ڕۆژی دوایـدا لـە دۆڕاو و زەرەرمەندانە .

وە خوای پایەبەرز لە سەر هەمـوو خەڵكی فەرز كـردووە كـەوا دینـداری بۆ بكەن بە پێی ئاینی ئیسلام ، بۆیـە قـسە لـە گـەڵ پێغەمبەرەكەیدا (ﷺ) دەكـات و دەفـەرموێت : ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾ [الأعراف] .

واتە : ئەی پێغەمبەر بڵـێ ئەی خەڵكینە من پێغەمبەری خـوام بـۆ ئێـوە هەر هەمووتان ئەو خوایەی كەوا موڵكی ئاسمانەكان و زەوی هـی ئـەوە هـیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێـت تـەنها ئـەو نـەبێت مـردوو زینـدوو دەكاتـەوە و زینـدوویش دەمرێنێـت لـە بـەر ئەمـە بـاوەڕ بێـنن بـە خـوا و پێغەمبەرە هەواڵپێدراوە نەخوێندەوارەكەی كەوا باوەڕی هەیە بە خـوا و وتەكانی و ئێوەش شوێنی بكەون بەڵكو هیدایەت دراوین .

وە لـە (صحیح مُسلم)دا هـاتووە (أبـو هریـرة ﷺ) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە كـەوا فەرموویـەتی : «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلاَّ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ»[1].

واتە : سوێند بەو خوایەی كە گیانی منی بەدەستە هیچ كەسێك نـی‌یە لەم ئوممەتەدا هاتنی من ببیسێت (واتە ئاینی ئیسلامی پێبگات) : جوولەكە بێت یاخود گاور ئەنجا بمرێت و باوەڕی بەو ئاینە نەهێنابێت كەوا منی پـێ

---

[1] رواه مسلم ، كتاب الإيـمان ، باب وجوب الإيـمان برسالة نبينا محمد ﷺ رقم : (٣٨٤) .

نێردراوە ئیللا ئەو کەسە دەبێتە خەڵکی ئاگری دۆزەخ .

وە باوەڕ بوون پێی بریتییە لە : بەڕاست زانینی ئەو ئاینەی کە پێی هاتووە لە گەڵ قەبوڵ کردن و ملکەچ بووندا ، نەك تەنها بەڕاست زانین ، لەبەر ئەمە (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) باوەڕدار نەبوو بە پێغەمبەر (ﷺ) لە گەڵ بەڕاست زانینی ئەو ئاینەش کە پێی هاتبوو ، وە لە گەڵ شایەتی دانیشی بەوەی کەوا باشترینی ئاینەکانە .

وە ئاینی ئیسلام : هەموو ئەو بەرژەوەندیانەی تێدایە کەوا لە ئاینەکانی پێشوودا هەبووە ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەو تایبەتمەندی و چاکەیەی تێدایە کەوا شیاو و گونجاوە بۆ هەموو کات و شوێن و ئوممەتێك ، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێت : ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴿٤٨﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆ تۆ بە حەق و ئەو کتێبانەی پێش خۆی بەڕاست دەخاتەوە و هەموو ئەو بەرژەوەندیانەشی تێدایە کەوا لە کتێبەکانی پێشوودا هەبووە و زاڵیشە بەسەر هەموویاندا .

وە مەبەست لە شیاوێتی ئاینی ئیسلام بۆ هەموو کات و شوێن و ئوممەتێك ئەوەیە کەوا دەست گرتن بە ئاینی ئیسلامەوە بەرژەوەندیەکانی ئوممەت ڕەد ناکاتەوە لە هەر کات و شوێنێکدا بێت ، بەڵکو چاکێتی ئوممەتی پێوە بەندە ، وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەوا ئیسلام ملکەچە بۆ هەموو کات و شوێن و ئوممەتێك هەروەکو هەندێك لە خەڵك دەیانەوێت .

ئاینی ئیسلام : ئاینی حەق و ڕاستییە کەوا ئەگەر هەر کەسێك بەڕاستی دەستی پێوەبگرێت ئەوا خوا ئەوەی بۆ مسۆگەر دەکات کەوا سەری بخات و

زاڵی بکات بەسەر جگە لە خۆیدا ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ هُوَ الَّذِيَ أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾ [الصف] .

واتە : ئەو خوایەی کەوا پێغەمبەرەکەی ناردووە بە هیدایەت (زانستی بەسوود) و دینی حەق (کردەوەی چاك) بۆ ئەوەی سەری خات بە سەر هەموو ئاینەکاندا ئەگەر چی هاوەڵبڕیاردەرەکانیش پێیان ناخۆش بێت .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾ [النور] .

واتە : خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن کەوا جێنشینیان بکات لە زەویدا هەروەکو چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی جێنشین کرد ، وە ئەو ئاینەشیان بۆ جێگیر و بەرقەرار کات کەوا پێی ڕازی بووە بۆیان و ترسەکەشیان بۆ بگۆڕێتەوە بە ئەمن و ئاسایش بوون بۆ ئەوەی من بە تەنها بپەرستن و بە هیچ شتێك هاوەڵ و شیرك ئەنجام نەدەن بۆم ، وە هەر کەسێك لە دوای ئەوە بێباوەڕی بکات ئەوا ئەوانە فاسق و لە ڕێدەرچوون .

وە **ئاینی ئیسلام : بیروباوەڕ و شەریعەتە** (واتە : لە گەڵ ئەوەدا کە بیروباوەڕە لە هەمان کاتدا دەستوری بەڕێوەبردنی ژیانیشە) ، وە کاملیشە لە بیروباوەڕ و هەموو بڕیارەکانیدا :

١ ـ فەرمان دەکات بە یەکتاپەرستی خوای گەورە ، وە ڕێگری دەکات لە شیرك و هاوەڵبڕیاردان بۆ خوا .

٢ ـ فەرمان دەكات بە ڕاستگۆیی ، وە ڕێگری دەكات لە درۆكردن .

٣ ـ فەرمان دەكات بە دادپەروەری ، وە ڕێگری دەكات لە ستەم كردن ، وە دادپەروەری بریتی‌یە لە یەكسانی لە نێوان شتە هاوشێوەكان و جیاكردنەوەی نێوان شتە جیاوازەكان ، وە دادپەروەری بریتی نی‌یە لە یەكسانیەكی ڕەها هەروەكو چۆن هەندێك لە خەڵك دەریدەبڕن لە كاتێكدا كە دەڵێن : ئاینی ئیسلام ئاینی یەكسانیە بە ڕەهایی ، چونكە بەڕاستی یەكسانی لە نێوان شتە جیاوازەكاندا ستەمە و ئاینی ئیسلامی پێ نەهاتووە و دەست خۆشیش لە ئەنجامدەری ئەم كارە ناكرێت .

٤ ـ فەرمان دەكات بە دڵپاكی و سەرڕاستی و ئەمانەت پارێزی ، وە ڕێگری دەكات لە ناپاكی و خیانەت كردن .

٥ ـ فەرمان دەكات بە وەفاداری و پەیمان پارێزی ، وە ڕێگری دەكات لە غەدر كردن و ناپاكی و پەیمان شكاندن و بێوەفایی .

٦ ـ فەرمان دەكات بە چاكە كردن لە گەڵ باوك و دایكدا ، وە ڕێگری دەكات لە ئەزێت و ئازار دانیان .

٧ ـ فەرمان دەكات بە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی ، وە ڕێگری دەكات لە پچڕاندنی ئەو پەیوەندیە .

٨ ـ فەرمان دەكات بە چاكەكاری لە گەڵ دراوسێدا ، وە ڕێگری دەكات لە خراپەكاری لە گەڵیاندا .

بەگشتی دەڵێم : بەڕاستی ئیسلام فەرمان دەكات بە هەموو ڕەوشتێكی بەرز و چاك ، وە ڕێگری دەكات لە هەموو ڕەوشتێكی سووك و خراپ .

وە فەرمان دەكات بە هەموو كردەوەیەكی چاك ، وە ڕێگری دەكات لە هەموو كردەوەیەكی خراپ .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ [النحل] .

واتە : بەڕاستی خوا فەرمان دەكات بە دادپەروەری و چاكەكاری و بەخشینی ماڵ بە خزمانی نزیك و ڕێگریش دەكات لە خراپەكاری و تاوان و ستەم ، بەمە ئامۆژگاریتان دەكات بۆ ئەوەی بیربكەنەوە .

# پایەكانی ئیسلام

پایەكانی ئیسلام : بریتی‌یە لەو بنچینانەی كەوا ئاینی ئیسلامی لە سەر بنیات نراوە و بریتی‌یە لە پێنج پایە كە باسكراون لەو فەرموودەیەی كە (ابن عمر ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە كەوا فەرموویەتی : ((بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسَةٍ : عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللّهُ ـــ وفي رواية : عَلَى خَمْسٍ ـــ : شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ ، وَالْحَجِّ)) ، فَقَالَ رَجُلٌ : الْحَجِّ وَصِيَامِ رَمَضَانَ ، قَالَ : لاَ ، ((صِيَامِ رَمَضَانَ وَالْحَجِّ)) هَكَذَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللّهِ (ﷺ)[٢] .

واتە : ئیسلام بنیات نراوە لە سەر پێنج پایە : لە سەر ئەوەی كەوا خوا بە تەنها بپەرسترێت ـ وە لە ریوایەتێكی تردا هاتووە : شایەتی دان بەوەی كەوا هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ، وە بەڕاستی (مُحمَّد ﷺ) عەبد و پێغەمبەری خوایە ، و ئەنجامدانی نوێژ ، و

---

[٢] رواه البخاري ، كتاب الإيمان ، باب الإيمان وقول النبي ﷺ : "بُنِيَ الإسلام على خمس" ، رقم : (٨) ، ورواه مسلم ، كتاب الإيمان ، باب بيان أركان الإسلام ودعائمه العظام ، رقم : (١١١) .

زەكات دان ، و ڕۆژووی ڕەمەزان ، و حەج كردن ، پیاوێك وتی : حەج كردن و ڕۆژووی ڕەمەزان ، (ابن عمـــر) فەرمووی : نەخێر ، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج كردن ، بەم شێوە بیستوومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) .

١ ـ شایەتی دان بەوەی كەوا **هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ، وە بەڕاستی** (مُحمَّـــد ﷺ) **عەبد و پێغەمبەری خوایە** :

بریتییە لە باوەڕێكی یەكلا و بێگومان كەوا بە شایەتی دان بە زمان دەریدەبڕێت ، ئەوەندە یەكلا و بێگومانە لەو باوەڕەیدا وەكو بڵێی بە چاو دەیبینێت ، وە ئەم شایەتی دانە كراوە بە یەك پایە لە گەڵ ئەوەی كە شایەتی پێدراو لە دانەیەك زیاترە :

ئەمەش یان لە بەر ئەوەیە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگەیەنەرە لە لایەن خوای گەورەوە ، ئەوا شایەتی دان بۆی بە عەبدایەتی و پێغەمبەرایەتی لە تەواوكەری شایەتی دانە بەوەی كە **هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا** .

وە یان لە بەر ئەوەیە كەوا ئەم دوو شایەتی دانە بنچینە و بنەمای ڕاست و دروستێتی و قەبوڵكردنی كردەوەكانە ، چونكە هیچ كردەوەیەك ڕاست و دروست نىیە و قەبوڵیش ناكرێت ئیللا بە نیەت پاكی بۆ خوای گەورە و شوێنكەوتنیش بۆ پێغەمبەرەكەی (ﷺ) نەبێت :

چونكە بە (نیەت پاكی بۆ خوای گەورە / الإخلاص لله) شایەتی (**هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا**) بە دی دێت ، وە بە (شوێنكەوتن بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ) شایەتی (**بەڕاستی** مُحمَّـــد ﷺ **عەبد و پێغەمبەری خوایە**) بە دی دێت .

وە لە بەرهەمەکانی ئەم شایەتومانە گەورەیە : ئازادکردنی دڵ و دەروونە لە بەندایەتی کردن بۆ دروستکراوەکان و هەروەها لە شوێنکەوتنیش بۆ جگە لە پێغەمبەران .

٢ ـ وە ئەنجامدانی نوێژ بە ڕێکوپێکی بریتییە لە : پەرستنی خوای گەورە بە کردنی نوێژەکان لە سەر شێوازێکی ڕێك و ڕاست و بەردەوام و تەواو و کامڵ لە ڕووی کاتەکان و شێوەی ئەنجامدانیەوە .

وە لە بەرهەمەکانی نوێژ کردن : فراوان بوونی سنگ و ئۆقرەگرتنی چاو و ڕێگری کردن لە خراپەکاری و تاوان .

٣ ـ زەکات دان بریتی‌یە لە : پەرستنی خوای گەورە بە بەخشینی ئەندازەی واجب کراو لەو ماڵانەدا کەوا حەقی زەکاتی تێدایە .

وە لە بەرهەمەکانی زەکات دان : پاك کردنەوەی دەروونە لە ڕەوشتی سوکی ڕەزیلی و چاوچنۆکی ، هەروەها پڕکردنەوەی پێداویستی ئیسلام و موسڵمانان .

٤ ـ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بریتی‌یە لە : پەرستنی خوای گەورە بە خۆگرتنەوە لە بەتاڵکەرەوەکانی ڕۆژوو لە ڕۆژی ڕەمەزاندا .

وە لە بەرهەمەکانی ڕۆژوو : ڕاهێنانی دەروونە لە سەر وازهێنان لە شتە خۆش و خوازراوەکان بە مەبەستی دەستخستنی ڕەزامەندی خوای گەورە .

٥ ـ حەج کردنی ماڵی خوا بریتی‌یە لە : پەرستنی خوای گەورە بە ڕۆیشتن بۆ ماڵە حورمەتگیراوەکەی بۆ ئەنجامدانی دروشمەکانی حەج .

وە لە بەرهەمەکانی حەج کردن : ڕاهێنانی دەروونە لە سەر بەخشینی توانای ماڵی و جەستەیی لە گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە ، لە بەر ئەمە

حەج کردن جۆرێکە لە جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورە .

ئەم بەرهەمانەی کە باسمان کردن بۆ ئەم پایە و بنەمایانەی ئیسلام و ئەوانەش کە باسمان نەکردوون ئەم ئوممەتە وا لێدەکات کەوا ببێت بە ئوممەتێکی موسڵمانی پاك و بێگەرد و دینداری ئەنجامبدات بۆ خوا بە دینی حەق و ڕاستی ، وە ڕەفتار بکات لە گەڵ دروستکراوەکانی خوادا بە دادپەروەری و ڕاستگۆیەتی ، چونکە دروشم و ئەحکامە شەرعیەکانی تری جگە لەم پایانە چاك دەبێت بە چاك بوونی ئەمانە ، وە بارودۆخ و حاڵی ئوممەت چاك دەبێت بە چاك بوونی باری ئاینی ئوممەت ، وە بە ئەندازەی لە دەست چوونی چاکێتی باری ئاینی ئوممەت چاکێتی و باش بوونی حاڵ و بارودۆخی لە دەست دەچێت و دەفەوتێت .

جا هەر کەسێك دەیەوێت ئەمەی بۆ ڕوونببێتەوە ئەوا با ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە :

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَـٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾﴾ [الأعراف] .

واتە : بەڕاستی ئەگەر خەڵکی شار و دێهاتەکان باوەڕبێنن و لە خوا بترسن و خۆپارێزی بکەن لە تاوان ئەوا ئێمە دەرگاکانی خێر و فەڕی ئاسمان و زەوییان بۆ دەکەینەوە بەڵام ئەوان حەق و ڕاستیان بە درۆ

خستەوە بۆیە ئێمەش لەناویانمان برد بە هۆی کردەوەکانی خۆیانەوە ، ئایا خەڵکی شار و دێهاتەکان دڵنیان لەوەی کەوا لە شەودا سزامان نایانگرێتەوە لە کاتێکدا کە خەوتوون ؟ یان ئایا خەڵکی شار و دێهاتەکان دڵنیان لەوەی کەوا لە کاتی چێشتەنگاودا سزامان نایانگرێتەوە لە کاتێکدا کە یاری دەکەن ؟ ئایا ئەوان دڵنیان لە مەکری خوا بەڕاستی کەس دڵنیا نییە لە مەکری خوا ئیللا خەڵکانێکی خەسارۆمەند نەبن .

وە با بڕوانێتە مێژووی خەڵکانی ڕابردوو ، چونکە بەڕاستی مێژوو پەند و ئامۆژگارییە بۆ خاوەن بیر و هۆشەکان ، وە چاو ڕۆشنییە بۆ ئەوانەی کەوا پەردە سەر دڵی نەگرتوون ، خواش یارمەتیدەرە .

# بنەماكانی بیروباوەڕی ئیسلامی

ئاینی ئیسلام ـ وەك لە پێشەوە باسمان كرد ـ بریتیـیە لە بیروباوەڕ و شەریعەت ، وە ئاماژەشمان كرد بۆ هەندێك لە دروشمەكانی و باسی ئەو پایانەی ئیسلامیشمان كرد كەوا بە بنچینە و بنەمای هەموو دروشم و ئەحكامەكانی تر دادەنرێن .

بنەماكانی بیروباوەڕی ئیسلامی بریتین لە : باوەڕبوون بە خوا و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەدەر بە خێر و شەڕیەوە .

وە قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەن لە سەر ئەم بنەمایانە .

خوای گەورە لە كتێبەكەیدا فەرموویەتی : ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴿١٧٧﴾﴾ [البقرة] .

واتە : چاكە بەوە نییە كەوا ڕوو بكەن لە ڕووەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەڵكو چاكە بەوەیە كە باوەڕت هەبێت بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەكان و كتێبەكان و پێغەمبەران .

خوای گەورە سەبارەت بە قەدەریش فەرموویەتی : ﴿إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴿٥٠﴾﴾ [القمر] .

واتە : ئێمە هەموو شتێكمان دروست كردووە بە قەدەر و ئەندازە ، وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك فەرمانە وەك چاوتروكانێك وایە .

وە لـە فـەرموودەكانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە وەڵامی (جبریل)دا كاتێك كە پرسیاری لێكرد سەبارەت بە ئیمان فـەرمووی : ((الإيـمَانُ : أنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَـدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ))[3].

واتە : ئیمان بریتی‌یە لەوەی كە : باوەڕ بێنیت بە خـوا و فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و باوەڕ بێنیت بە قەدەر بـە خێـر و شەڕیەوە .

## باوەڕ بوون بە خوای گەورە

باوەڕبوون بە خوای گەورە چوار بوار دەگرێتەوە :

**بواری یەكەم : باوەڕبوون بە بوونی خوای گەورە :**

بەڵگەیش لە سەر بوونی خوای گەورە بریتی‌یـە لـە : فـیترەت و عـەقڵ و شەرع و هەست پێكردن :

١ ـ بەڵگەی فیترەت لە سەر بوونی خـوای پـاك و بێكـەموكوڕی ئەوەیـە كـە : بەڕاسـتی هـەموو دروسـتكراوێك هـەماركراوە و بـەدیهێنراوە لـە سـەر بـاوەڕبوون بـە خـوای بەدیهێنـەر و دروسـتكاری بـە بـێ بیرلێكردنـەوە یـان فێركردنی پێش وەخت ، وە لاش نـادات لـە خواسـتراوی ئـەم فیترەتـە ئـیللا كەسێك نەبێت كەوا شتێك هاتبێت بە سەر دڵیدا كە لەم ڕاستی‌یە لایدابێت و گۆڕیبێتی ، ئەمەش لە بەر فەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ) : ((مَا مِنْ مَوْلُـودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ))[4].

---

[3] رواه مسلم ، كتاب الإيمان ، باب بيان الإيمان والإسلام والإحسان ، رقم : (٩٣) .

[4] رواه البخاري ، كتاب الجنائز ، باب ما قيل في أولاد المشركين ، رقم : (١٣١٩) .

واته : هیچ مندالّێك نىیه له دایك ببێت ئیللا له سه‌ر فیتره‌ت* له دایك ده‌بێت ، دوای ئه‌وه باوك و دایكی ده‌یكه‌ن به جووله‌كه یان به گاور یان به ئاگر په‌رست .

٢ ـ به‌لّگه‌ی عه‌قلّ له سه‌ر بوونی خوای گه‌وره ئه‌وه‌یه :

كه‌وا ئه‌م دروستكراوانه ئه‌وانه‌ی رابوردوو و ئه‌وانه‌ی داهاتوویشیان پێویسته به‌دیهێنه‌رێك هه‌بێت كه‌وا دروستیانی كردبێت و هێنابێتیانه دی ، چونكه مومكین نىیه كه خۆیان خۆیانیان به‌دیهێنابێت ، وه مومكینیش نىیه كه به رێكه‌وت به‌دیهاتبێتن .

مومكین نىیه كه خۆیان خۆیانیان به‌دیهێنابێت : له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شت خۆی خۆی دروست ناكات چونكه ئه‌و شته له پێش به‌دیهاتنی و هه‌بوونی نه‌بوو (عه‌ده‌م) بووه جا چۆن ده‌بێت به‌دیهێنه‌ر و دروستكار بێت ؟!

وه مومكینیش نىیه كه به رێكه‌وت به‌دیهاتبێتن : له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌موو به‌دیهێنراوێك پێویسته به‌دیهێنه‌رێكی هه‌بێت ، وه چونكه هه‌بوونی ئه‌م دروستكراوانه به‌م شێوازه رێكخراوه سه‌رسوڕهێنه‌ر و یه‌كخستنه پێكهاتوو و په‌یوه‌ندیىیه یه‌ككگرتووه كه له نێوان هۆكاره‌كان و ئه‌وانه‌ی كه له پشتیانه‌وه‌ن هه‌یه ، وه ئه‌وه‌ش كه له نێوان بونه‌وه‌ران هه‌ندێكیان له‌گه‌لّ هه‌ندێكی تریاندا هه‌یه رێگر ده‌بێت رێگرتنێكی یه‌كلایی كه‌وا بوونیان به رێكه‌وت بێت ، چونكه ئه‌وه‌ی كه به رێكه‌وت دێته بوونه‌وه رێكخراو نىیه له بنچینه‌ی هه‌بوونیه‌وه جا چۆن رێكخراو ده‌بێت له كاتی مانه‌وه و پێشكه‌وتنیدا ؟!

---

* فیتره‌ت واته : خواناسی و ئیسلامه‌تی .

وە ئەگەر مومکین نەبێت ئەم دروستکراوانە خۆیان خۆیانیـان بـەدیهێنابێت ، وە بـە ڕێکـەوتیش بەدینـەهاتبێتن ، ئـەوا تـەنها ئـەوە دەمێنێتـەوە کـە بەدیهێنەرێکیان هەبێت ئەویش خوای پەروەردگاری هەموو جیهانە .

وە خوای گەورە ئـەم بەڵگـە عـەقڵی و یەکلاکەرەوەییـەی بـاس کـردووە لەوێدا کە فەرموویەتی : ﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ [الطور] .

واتە : ئایا ئەو دروستکراوە بێباوەڕانە بە بێ هیچ دروست کراون یان خۆیـان بەدیهێنەر و دروستکاری خۆیانن ؟*

کەواتە ئەو بێباوەڕانە دروست نەکراون بە بێ دروستکار و بەدیهێنـەر ، وە خۆشیان خۆیان دروست نەکردووە ، بۆیە تەنها ئـەوە دەمێنێتـەوە کـەوا دروستکار و بەدیهێنەریان خوای کار پڕیەرەکەت و پایە بـەرز بێـت ، لـە بـەر ئەمـە کاتێـك (جبیر بن مطعم ﷺ) گـوێی لـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـوو سـورەتی (الطــــور)ی دەخوێنــدەوە و گەیـشتە ئـەم ئایەتانـە کـە خـوای گـەورە فەرموویەتی :

﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ [الطور] .

---

* بێ گومان نە ئەوەیانەتانێ کە بێ هیچ دروست کرابێتن چونکە عەقڵ هەرگیز تەصەوری ئەوە ناکات کەوا شتێك لە خۆڕا و بە بێ بەدیهێنەر دروست بوو بێت و هاتبێتە بوونەوە ، بەڕاستی ئەمە مەحاڵە !

وە نە ئەوەشیانە کەوا خۆیان خۆیانیان دروست کردبێت چونکە بە هەمان شێوە عـەقڵ هـەرگیز تەصەوری ئەوە ناکات کەوا دروستکراوێك کـە خـۆی لـە خۆیـدا دروسـتکراوە بتوانێـت خـۆی دروسـت بکات ، بەڕاستی ئەمە مەحاڵە !

کەواتـە دەبێـت کەسـێك هـەبێت ئـەو دروسـتکراوانەی دروسـت کردبێـت کـە بریتیـیە لـە خـوای بەدیهێنەر و خولقێنەری هەموو بوونەوەر و دروستکراوەکان .

واتـه : ئایـا ئـەو بێباوەڕانـە لـە هیـچەوە دروسـت کـراون یـان خۆیـان دروستکارن و خۆیان دروست کردووە ؟ یان ئاسمانەکان و زەویـان دروسـت کردووە ؟ ئەوان دەزانـن ئەمانـە هیـچیان وا نیـە و تـەنها خـوا بەدەهێنەریانـە بەڵام دڵنیا نا بن ، ئایا خەزێنـەکانی ڕەحمـەتی خـوا لای ئەوانـە یـان ئـەوان دەسەڵاتیان هەیە بە سەر دروستکراوەکانی خوادا ؟ بێگومان نە هیچیان بـە دەستە و نە دەسەڵاتیشیان بە سەر دروستکراوەکانی خوادا هەیە .

(جبیر ﷺ) کاتێك گوێی لەم ئایەتانـە بـوو بێبـاوەڕ و موشـریك بـوو لـە گەڵ ئەوەشدا وتـی : نزیـك بـوو دڵـم بفڕێـت ، وە ئـەوەش سـەرەتای جـێگیر بوونی ئیمان بوو لە نێو دڵمدا[٥] .

با نموونەیەك بهێنینەوە کە ئەمەمان بۆ ڕوون بکاتەوە :

بەڕاستی ئەگەر کەسێك باسـی باڵاخانەیـــەکی بـەرزت بـۆ بکـات ، کـە چواردەور درابێت بە چەندین باخچە ، وە چـەندین ڕوبـار بـە نێویـدا بڕوات ، وە پــڕ کرابێــت بــە چــەندین فــەرش و ڕاخــراو ، وە ڕازێنرابێتــەوە بــە جۆراوجـۆرترین شـتی ڕازاوە لـە بنـەماکانی و تەواوکـەرەکانی ، ئـەنجا ئـەو کەسە پێت بڵێت : بەڕاستی ئـەم باڵاخانەیـە و ئەوەشـی کـە تێیـدا هەیـە لـە کامڵێتی خۆی خۆیی بەدیهێناوە ! یان هەروا بە ڕێکەوت هاتووەتـە بوونـەوە بە بێ بەدیهێنەر ! ئەوا تۆ دەستپێشخەری دەکەیت لـە نکۆڵی کردنـی ئـەو قسەیە و بـە درۆ خـستنەوەی ، وە ئـەو قـسەیەی بـە قـسەیەکی گێلانـە دەژمێریـت ، ئایا دوای ئـەوە دەبێـت ئـەم گەردوونـە فراوانـە : بـە زەوی و ئاسمــان و ئەســتێرەکان و بوارەکــان و ڕێکخــستنە ســەیرە زۆر جــوان و

---

[٥] رواه البخاري مفرقاً ، كتاب التفسير ، باب تفسير سورة الطور ، رقم : (٤٥٧٣) .

سەرسوڕهێنەرە خۆی خۆیی بەدیهێنابێت یان بە ڕێکەوت هاتبێتە بوونەوە بە بێ بەدیهێنەر ؟!

٣ ـ بەڵگەی شەرع لە سەر بوونی خوای گەورە ئەوەیە :

کەوا هەموو کتێبە ئاسمانییەکان ئەمە دەردەبڕن و ئاشکرای دەکەن ، وە ئەوەی کە پێی هاتوون لە حوکمە دادپەروەریانەکان کەوا بەرژەوەندییەکانی بوونەوەر دەگرنە خۆیان بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کەوا لە لایەن پەروەردگارێکی دانا و زانا بە بەرژەوەندییەکانی دروستکراوەکانی هاتوون ، وە ئەوەی کە پێی هاتوون لە هەواڵە گەردوونیەکان کەوا ڕۆژگار شایەتی دا بە ڕاستێتیان بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کەوا ئەو کتێبانە لە لایەن پەروەردگارێکی بەتوانا بە سەر بەدیهێنانی ئەوانەی کە هەواڵی پێداون هاتوون .

٤ ـ بەڵگەی هەست پێکردن لە سەر بوونی خوای گەورە لە دوو ڕووەوەیە :

**یەکەمیان** : بەڕاستی ئێمە ئەوەندە دەبیستین و دەبینین لە وەڵامدانەوەی پاڕانەوەی ئەوانەی کەوا لە خوا دەپاڕێنەوە ، وە لە فریاکەوتنی داماو و لێقەوماوەکان کەوا بەڵگەیەکی یەکلایکەرەوە بن لە سەر بوونی خوای گەورە ، خوای پاك و بێکەم و کوڕی فەرموویەتی : ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ ﴿٧٦﴾﴾ [الأنبياء] .

واتە : وە لە پێشەوە نوح بانگی کردین ئێمەش وەڵامیمان دایەوە .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ ﴿٩﴾﴾ [الأنفال] .

واتــه : لــه كاتێكـدا كــه ئێــوه داوای فریاكــهوتنتان دهكـرد لــه خــوای پهروهردگارتان و ئهویش وهڵامی دانهوه و فریاتان كهوت .

وه له (صحيح البخاري)دا هـاتووه (أنس بن مالــك ﷺ) فهرموويـهتی : ((إنَّ أعرابياً دخل يَوْمَ الْجُمُعَة وَالنَّبيُّ (ﷺ) يَخْطُبُ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّه هَلَــكَ الْمَــالُ ، وَجَاعَ الْعِيَالُ ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ ودعا ، وَمَا نَرَى فِي السَّمَاءِ قَزَعَــةً ، فَثَــارَ السَّحَابُ أَمْثَالَ الْجِبَالِ ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِــهِ (ﷺ) .

وفي الْجُمُعَة الأُخْرَى : قَامَ ذَلكَ الأَعْرَابِيُّ أَوْ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّه تَهَدَّمَ الْبِنَــاءُ ، وَغَرِقَ الْمَالُ ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَقَالَ : اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا ، فَمَــا يُــشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنَ السَّحَابِ إِلاَّ انْفَرَجَتْ))[٦] [صحيح البخاري رقم : (٨٩١)] .

واته : پیاوێكی دهشتهكی له ڕۆژی جومعهدا هاته ژوورهوه له كاتێكدا كه پێغهمبهر (ﷺ) وتاری دهخوێندهوه ، ئهنجا وتی : ئهی پێغهمبـهری خـوا سـهروهت و سـامانمان تیاچـو ، خێزانمـان برسـی بـوو ، كهواتـه لـه خـوا بپاڕێرهوه بۆمان ، پێغهمبـهریش (ﷺ) هـهردوو دهسـتی بـهرز كـردهوه و لـه خـوا پاڕایـهوه ، وه هـیچ پهڵـه هـهورێكمان نـهدهبینی بـه ئاسمانـهوه ، جـا كوتـوپڕ پهڵـه هـهور بـڵاوهی كـرد و تهقیـهوه لـه شـێوهی شـاخهكان ، وه پێغهمبهر (ﷺ) له مینبـهرهكهی دانهبهزیه خـوارهوه تـاوهكو بینـیم بـاران بـه ڕیشیدا دهچۆڕایه خوارهوه .

وه لـه جومعـهی دووهمـدا هـهمان پیـاوی دهشـتهكی یـان كهسـێكی تـر ههستا و وتی : پێغهمبهری خوا خانووهكان رووخان ، ماڵ و سـامان لـه نێـو ئـاودا نقـوم بـوون ، كهواتـه لـه خـوا بپـاڕێرهوه بۆمـان ، پێغهمبـهریش (ﷺ)

هەردوو دەستی بەرز کردەوە و وتی : خوایە بیبارێنە بە سەر دەوروبەرماندا نەك بە سەر سەرماندا ، جا ئاماژەی نەدەکرد بۆ هەر لایەکی هەورەکە ئیللا بەو لایەدا دەتەقیەوە .

وە بەردەوام وەڵامدانەوەی پاڕانەوەی ئەوانەی کەوا لە خوا دەپاڕێنەوە شتێکی بینراوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ، ئەوەش بۆ کەسانێك کە بەڕاستی هانا بۆ لای خوای گەورە ببەن ، وە مەرجەکانی وەڵامدانەوەی دوعا لە خۆیاندا جێبەجێ بکەن .

**ڕووی دووەمیان** : بەڕاستی نیشانەی پێغەمبەران کە ناو نراون بە (المعجزات) و خەڵك دەیانبینن یان دەیانبیستن ، بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەن لە سەر هەبوونی ئەو کەسەی کە ناردوونی ، ئەویش خوای گەورەیە ، چونکە ئەوانە شتانێکن بەدەر لە توانای مرۆڤ ، خوای گەورە بەڕێیان دەکات و بە دیان دەهێنێت بۆ ئەوەی ببنە پشتگیرییەك و سەرخستنێك بۆ پێغەمبەرانی .

نموونەی ئەمە : نیشانەی پێغەمبەر (موسی ﷺ) کاتێك کە خوای گەورە فەرمانی پێکرد بەوەی کە بە گۆچانەکەی بدات لە دەریاکە ، ئەویش لێی دا ، ئەنجا دوانزە ڕێگای وشکی لێ تەقیەوە و ئاو بە نێویاندا کەوتە ڕێ وەکو شاخەکان ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾ [الشعراء] .

واتە : سروشمان نارد بۆ موسا کەوا بە گۆچانەکەت بدە لە دەریاکە ئەویش لێی دا ، ئەنجا دەریاکە تەقیەوە بۆ دوانزە تەپۆڵکە کە هەر تەپۆڵکەیەکیان وەکو شاخێکی گەورە وابوو .

نموونەی دووەم : نیشانەی پێغەمبەر (عیسی ﷺ) کەوا مردووی زیندوو دەکردەوە و لە گۆڕەکانیان دەریانی دەهێنایە دەرەوە بە ئیزنی خوا ، خوای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی : ﴿وَأُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۖ (٤٩)﴾ [آل عمران] .

واتە : وە مردوو زیندوو دەکەمەوە بە ئیزنی خوا .

وە فەرموویەتی : ﴿وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي ۖ (١١٠)﴾ [المائدة] .

واتە : وە تۆ مردوو لە گۆڕ دەهێنیتە دەرەوە بە ئیزنی من .

نموونەی سێیەم : نیشانەی پێغەمبەر (محمد ﷺ) کاتێک کەوا قورەیشیەکان لە مەککەدا داوای نیشانەیەکیان لێی کرد ، پێغەمبەریش (ﷺ) ئاماژەی کرد بۆ مانگ ، ئەویش بوو بە دوو لەتەوە و خەڵکیش بینیان ، وە لەم بارەیەوە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ (١) وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ (٢)﴾ [القمر] .

واتە : ڕۆژی دوایی نزیک بووەتەوە و مانگیش لەت بوو ، وە ئەگەر بێباوەڕەکان نیشانەیەك ببینن پشتهەڵدەکەن و دەڵێن ئەمە سیحرێکی بەردەوامە .

جا ئەم نیشانە هەست پێکراوانە کەوا خوای گەورە بەڕێیان دەکات و بە دییان دەهێنێت بۆ ئەوەی ببنە پشتگیرییەك و سەرخستنێك بۆ پێغەمبەرانی ، بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەن لە سەر هەبوونی خوای گەورە .

**بواری دووەم کە باوەڕبوون بە خوای گەورە دەیگرێتەوە :**

باوەڕ بوونە بە پەروەردگارێتی خوای گەورە واتە باوەڕبوون بەوەی کە تەنها خوای گەورە پەروەردگارە و نە هاوبەشی هەیە و نە یارمەتیدەر .

وە **پەروەردگار** : ئەوەیە کەوا دروست کردن و خاوەنێتی و بڕیار دانی بە دەست بێت ، جا دروستکار (بەدیهێنەر) نی‌یە تەنها الله نەبێت ، وە خاوەنی ڕەها نی‌یە تەنها الله نەبێت ، وە بڕیار دان بە دەستی کەسەوە نی‌یە تەنها الله نەبێت ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ ﴿٥٤﴾﴾ [الأعراف] .

واتە : بزانە کەوا دروست کردن و بڕیار دان تەنها بۆ خوایە .

وە فەرموویـــــــەتی : ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ﴿١٣﴾﴾ [فاطر] .

واتە : ئەوە خوای پەروەردگارتانە کەوا موڵك هی ئەوە و ئەوانەش کە ئێوە دەیانپەرستن و هاواریان تێدەکەن جگە لە خوای پەروەردگار خاوەنی توێژاڵی سەر ناوکە خورمایش نین و تەنانەت ئەوەشیان بە دەست نی‌یە .

وە نەشزانراوە کەوا هیچ کەسێك لە دروستکراوەکان نکۆڵی (ئینکاری) کردبێت لە پەروەردگارێتی خوای پاك و بێ‌کەم وکوڕی ، ئیللا مەگەر کەسێکی ملنەدەر نەبێت کە خۆشی باوەڕی نی‌یە بەوەی کە دەیڵێت ، هەر وەکو چۆن لە (فیرعەون)ەوە رووی دا ، لە کاتێکدا کە بە گەلەکەی خۆیی وت : ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾﴾ : من پەروەردگاری گەورەی ئێوەم [النازعات] .

وە (فیرعەون) وتی : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي ﴿٣٨﴾﴾ [القصص] .

واتە : ئەی خەڵکینە* وا نازانم پەرستراوێکی ترتان هەبێت جگە لە من .

---

* وشەی (مَلَأ) لە زمانی عەرەبیدا بۆ خەڵکێکی تایبەت بە کار دەهێنرێت کە لە زمانی کوردیدا پێیان دەوترێت : (پیاوماقوڵان یان ڕاوێژکاران و پیاوانی دەوروبەری کاربەدەستان) .

بەڵام ئەمەی (فیرعەون) لە باوەڕپێبوونەوە نەبوو ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۝١٤﴾ [النمل] .

واتە : (فیرعەون و گەلەکەی) لە ڕواڵەتدا دانیان نەنا بە ئایەتەکانی خوا بۆیان و لە ناخیشەوە دڵنیا بوون لێیان کەوا لە لایەن خواوە هاتوون ئەمەش بە هۆی ستەمکاری و خۆبەگەورە زانینیانەوە بوو** .

وە پێغەمبەر (موسی ﷺ) بە فیرعەونی وت ـ وەك خوای گەورە لێیەوە دەیگێڕێتەوە ـ : ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ۝١٠٢﴾ [الإسراء] .

واتە : بەدڵنیاییەوە تۆ دەزانیت ئەم ئایەتانە کەس داینەبەزاندوون ئیللا پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی نەبێت کە بەڵگەن لە سەر ڕاستێتی ئەو بەرنامەیەی کە من پێی هاتووم ، وە بەڕاستی من دڵنیام ئەی فیرعەون کەوا تۆ تیاچوویت و بەر لەعنەتی خوا کەوتویت .

---

** دوو ڕوونکردنەوەی کورت :

١ ـ (جَحَدُوا بِهَا) واتە : بە زمان نکوڵیان لێ کرد و دانیان پێدا نەنا ، چونکە (جَحَدَ) ئینکاری کرد (فعلُ اللسان)ـە کاری زمانە ، بەڵام (اسْتَيْقَنَتْهَا) واتە : بە دڵ دڵنیا بوون لێیان ، چونکە (اسْتَيْقَنَ) دڵنیا بوو (فعلُ القلب)ـە کاری دڵە ، کەواتە فیرعەون و شوێنکەوتەکانی ئینکاری کردنیان بۆ خوا و ئایەتەکانی تەنها بە زمان بووە چونکە ئەوان لە ناخەوە دڵنیا بوون لە هەبوونی خوای پەروەردگار.

٢ ـ هۆی ئەم ئینکاری کردن و دان پێدا نەنانەی فیرعەون و شوێنکەوتەکانی دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار کە لێرەدا خوای گەورە باسی کردوون : ﴿ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ واتە : بۆ ئەوەی بتوانن ستەم بکەن و خۆیان بەرز ڕاگرن بە سەر خەڵکدا و دەست درێژیان بکەنە سەر ، کەواتە وشەی (ظُلْمًا) و (عُلُوًّا) بە (مفعول لأجلهِ) (إعـراب) شیدەکرێنەوە ، چونکە ئەگەر بێتوو ئەوان دانیان بە هەبوونی خوادا بهێنایەت ئەوا نەیاندەتوانی ستەم بکەن و خۆیان بەرز ڕاگرن چونکە دەربڕینی باوەڕبوون بە خوا و ستەم کردن و خۆ بەرزڕاگرتن پێکەوە ناگونجێن و نەسازن .

لەبەر ئەمە هاوبەش ئەنجامدەرەکان (موشریکەکان) دانیان دەنا بە پەروەردگاریتی خوای گەورەدا (یُقرُّون بالربوبیَّة) ، لەگەڵ ئەوەشدا هاوبەشیان بۆ بڕیادەدا لە پەرستراویتیدا (ویُشرکون في الألوهیَّة) خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ [المؤمنون] .

واتە : ئەی پێغەمبەر بە هاوبەشبڕیادەرەکان بڵێ : ئایا زەوی و ئەوەشی کە تێیدا هەیە موڵکی کێن ؟ ﴿٨٤﴾ ئەوانیش دەڵێن : موڵکی خوان ، بڵێ : ئایا ئەی بۆ بیر ناکەنەوە ﴿٨٥﴾ بڵێ : کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیە و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە ﴿٨٦﴾ ؟ ئەوانیش دەڵێن : خوایە ، بڵێ : ئایا ئەی بۆ لە خوا ناترسن و خۆپارێزی ناکەن لە تاوان ﴿٨٧﴾ بڵێ : موڵکی هەموو شتێك بە دەستی کێیە و ڕێگری دەکات و ڕێگری لێناکرێت ئەگەر ئێوە دەزانن ﴿٨٨﴾ ؟ ئەوانیش دەڵێن : ئەوە بۆ خوایە ، بڵێ : ئایا ئەی بیر و هۆشتان بۆ کوێ دەچێت وەکو بڵێی سیحرتان لێکرابێت ؟

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ [الزخرف] .

واتە : ئەگەر پرسیار بکەیت لە هاوبەش ئەنجامدەرەکان ئایا کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ؟ بەدڵنیایی دەڵێن : خوای بەدەسەڵات

و زانا دروستی کردوون .

وه خوای پاك و بێ کهم و کوڕی فهرموویهتی : ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾﴾ [الزخرف] .

واته : ئهگهر پرسیار بکهیت له هاوبهش ئهنجامدهرهکان ئایا کێ ئێوهی دروست کردووه ؟ بهدڵنیایی دهڵێن : خوا ، ئایا بۆ جگه له خوا دهپهرستن و به ناحهق شهریکی بۆ بڕیار دهدهن .

وه بڕیار و فهرمانی خوا بڕیار و فهرمانی گهردوونی و شهرعیش دهگرێتهوه ، جا ههر وهکو چۆن بهڕێوهبهری گهردوونه و فهرمانڕهوایه تێیدا بهوهی که خۆی ویستی لێی ههبێت به پێی ئهوهی که دانایهتی خوا دهیخوازێت ، به ههمان شێوه فهرمانڕهوایشه تێیدا به دانانی پهرستشهکان (العبادات) و ئهحکامهکانی مامهڵهکان (المعاملات) به پێی ئهوهی که دانایهتی خوا دهیخوازێت ، جا ههر کهسێك لهگهڵ خوای گهورهدا بهرنامهداڕێژێك ههڵبژێرێت له پهرستشهکاندا یان بڕیاردهرێك ههڵبژێرێت له بواری مامهڵهکاندا ، ئهوا بهڕاستی ئهو کهسه شهریکی بۆ خوا بڕیارداوه ، و ئیمانی به دی نههێناوه .

**بواری سێیهم که باوهڕبوون به خوای گهوره دهیگرێتهوه :**

باوهڕبوونه به پهرستراوێتی خوا (الإيمان بألوهيته) ، واته : باوهڕبوون بهوهی که بهڕاستی تهنها خوا پهرستراوی حهقه و هاوبهشی نییه ، وه [(الإله) بمعنَى : (المألوه) أي : (المعبود) حُبًّا وتعظيماً] واته : پهرستراو له بهر خۆشهویستی و گهورهیی .

خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾﴾ [البقرة] .

واتە : پەرستراوی ئێوە تەنها یەك پەرستراوە هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە ئەو نەبێت ئەویش میهرەبان (خاوەنی ڕەحمەتێکی فراوانە) و بە بەزەییە .

وە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾﴾ [آل عمران] .

واتە : خوا شایەتی داوە بەوەی کەوا هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت هەروەها فریشتەکان و زانایانیش شایەتیەکی ڕاوەستاو لە سەر دادپەروەری ، هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت خوا دەسەلاتدار و دانایە .

وە هەر کەسێك پەرستراوێك هەڵبژێرێت لەگەڵ خوادا ، بیپەرستێت جگە لە خوا ، ئەوا ئەو پەرستراوێتیـیە پوچەڵە ، خـوای گەورە فەرموویـەتی : ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾﴾ [الحج] .

واتە : ئەوە لەبەر ئەوەیە کەوا بەڕاستی تەنها پەرستراوێتی خوا حەق و ڕاستە ، وە بەڕاستی ئەو پەرستراوانەی کە هاویەش ئەنجامدەرەکان دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە جگە لە خوا ئەوە پوچەڵە ، وە بەڕاستی تەنها خوا بەرز و گەورەیە .

وە ناونانیـان بـە (پەرستراو / خوداوەنـد) مافـی پەرستراوێتیان پێنابەخشێت ، خوای گەورە سەبارەت بە ـ سێ بتە پەرستراوەکان لە لایەن

هاوبـەش ئەنجامـدەرەکانی مەککـە و دەوروبـەری - (اللَّتَ وَالْعُزَّىٰ وَمَنَوٰةَ) فەرموویـــەتی : ﴿إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ﴿٢٣﴾﴾ [النجم] .

واتـە : ئەمانـە هـیچ نـین تـەنها چـەند ناوێـك نـەبێت کـەوا ئێـوە و باوباپیرانتـان ناوتـان لێنـاون و خـوا هـیچ بەڵگەیـەکی لـە بارەیانـەوە دانەبەزاندووە .

وە خوای گەورە سەبارەت بە پێغەمبەر (هود عليه السلام) کە بە گەلەکەیی وتووە : فەرموویەتی : ﴿أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ﴿٧١﴾﴾ [الأعراف] .

واتـە : مـشتومڕم لەگـەڵ دەکـەن سـەبارەت بـە ناوانێـك کـەوا ئێـوە و باوباپیرانتـان ناوتـان لێنـاون و خـوا هـیچ بەڵگەیـەکی لـە بارەیانـەوە دانەبەزاندووە .

وە خوای گەورە سەبارەت بە پێغەمبەر (یوسف عليه السلام) کە بە دوو هاوەڵی ناو سجنەکەی وتووە : فەرموویـەتی : ﴿ءَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ﴿٤٠﴾﴾ [یوسف] .

واتە : ئایا چەند پەرستراوێکی پەرتەوازە - لە نێوان دار و بەرد و گۆڕ و مردوو و خۆر و فریشتە ... هتد - باشترن یاخود خـوای تـەنها و بەدەسـەڵات ﴿٣٩﴾ ؟ ئێوە هیچ ناپەرستن جگە لە خوا تەنها چەند ناوێك نـەبێت کـەوا ئێـوە و باوباپیرانتـان ناوتـان لێنـاون و خـوا هـیچ بەڵگەیـەکی لـە بارەیانـەوە دانەبەزاندووە .

لەبەر ئەمە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە گەلەکانیان فەرمووە :

﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۞﴾ [الأعراف] .

واتە : خوا بپەرستن بە تەنها هیچ پەرستراوێکتان نی یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە ئەو .

بەڵام هاوبەش ئەنجامدەرەکان خۆیان گرتەوە لە ئەمە و قەبوڵیان نەکرد و چەندین پەرستراوی تریان هەڵبژارد جگە لە خوا و دەیانپەرستن لەگەڵ خوای پاك و بەرزدا و داوای سەرکەوتن و فریاکەوتنیان لێیان دەکرد .

وە بەڕاستی خوای گەورە هەڵبژاردنی هاوبەش ئەنجامدەرەکانی بۆ ئەم پەرستراوانە پوچەڵ کردووەتەوە بە دوو بەڵگەی (عەقڵی) :

**یەکەم** : بەڕاستی ئەم پەرستراوانەی کە ئەوان هەڵیانبژاردوون هیچ تایبەتمەندێتی پەرستراوێتیان تێدا نی یە ، چونکە ئەم پەرستراوانە دروستکراون و هیچ دروست ناکەن ، وە هیچ سوودێك نامێنن بۆ ئەوانەی کە دەیانپەرستن و هیچ زیانێکیشیان لێ دوور ناخەنەوە ، وە نە ژیانیان بە دەستە و نە مردنیش ، وە خاوەنی هیچ شتێك نین لە ئاسمانەکان و هاوبەشیش نین تێیدا .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا ۞﴾ [الفرقان] .

واتە : هاوبەش ئەنجامدەرەکان چەند پەرستراوێکیان هەڵبژاردووە جگە لە خوا کە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن و خۆیان دروستکراون و بۆ

خودی خۆشیان نەزیان و نەسوودیشیان بە دەست نی‌یە و نە مردن و نە ژیان و نە زیندووکردنەوەشیان بە دەست نی‌یە .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ﴿٢٣﴾ ﴾ [سبأ] .

واتە : ئەی پێغەمبەر بڵێ بە موشریکەکان : بانگ کەنە ئەوانەی کە دەیانپەرستن جگە لە خوا و داوایان لێدەکەن کەوا سوودتان پێبگەیەنن و زیانتان لێدووربخەنەوە تا بۆتان دەرکەوێت کە ئەوانە : خاوەنی سەنگی مێرولەیەکیش نین لە ئاسمانەکان و زەویدا ، وە شەریکی خواش نین تێیاندا ، وە یاریدەدەر و جێگری خواش نین لە هیچ شتێکدا ، وە تکا و ڕجا و شەفاعەتیش سوودی نی‌یە لای خوا ئیللا بۆ کەسێك نەبێت کە ئیزن و روخسەتی پێدابێت * .

---

* واتە بۆ ئەوەی ناشیاوێتی و ناشایستەیەتی پەرستراوێتی غەیری خوا نیشانی موشریکەکان بدەیت و بەڵگەی ڕوون بخەیتە بەردەستیان لەسەر ئەوەی کە پەرستراوەکانیان بە هیچ شێوەیەك هیچ لە سود و زیانیان بەدەست نی‌یە ، کەوابو شایستەی ئەوە نین ڕەجای دەست خستنی خێر و لادانی زیانیان لێ بکرێت و هاواریان بکرێتێ لەبەر ئەوەی هیچیان بەدەست نی‌یە ، چونکە ئەوانە :

- خاوەنی سەنگی مێرولەیەکیش نین سەربەخۆ لە ئاسمانەکان و زەویدا.
- وە لەوەش کەمتر بە شەراکەتیش لەگەڵ خوا هیچ بەشێکیان نی‌یە.
- وە لەشەراکەتیش کەمتر یاریدەدەر و جێگری خواش نین لە هیچ شتێکدا .
- وە هەروەها لەوەش کەمتر ناتوانن تکا و ڕجاو شەفاعەتیش بکەن لای خوا بێ ئیزن و ڕوخسەتی ئەو بە تەواوی .

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە غەیری خوا هیچی بەدەست نی‌یە ، کە هیچیشی بەدەست نەبێت بێ عەقڵی و بێ شەرمی‌یە مرۆڤ دڵی بەوان خۆش بێت و پشتیان پێ‌ببەستێت ، چونکە مرۆڤ کاتێك داوا لە یەکێك دەکات لەبەر ئەوە داوای لێ دەکات باوەڕی وایە کە شتێکی بەدەست بێت لە هێنانی خێر و لادانی زیان بە یەکێك لەم چوار شێوەیە :

(١) بەشێوەی سەربەخۆیی خاوەنی سوڵتە بێت (علی وجه الاستقلال) .

(٢) یاخود کە سەربەخۆییش نەبێت بە هاوبەشی و شەراکەت لەگەڵ یەکێکی تری خاوەن دەسەڵاتدا (علی وجه الاشتراك) .

-

وە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَا أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ ﴾ [الأعراف] .

واتە : ئایا کەسانێك و شتانێك دەکەن بە شـەریکی خـوا و دەیانپەرستن و هاواریـان تێدەکـەن کـەوا هـیچ شـتێك دروسـت ناکـەن و خۆیـان دروسـت دەکرێن ﴿١٩١﴾ وە ناتوانن سەریان بخەن و نە خودی خۆشیان سەردەخەن .

جا ئەگەر ئەمە حاڵی ئەو پەرستراوانە بێت ئـەوا بەڕاسـتی کرنـیـان بـە پەرستراو گێلانەترین گێلێتیەیە و پوچەڵترین پوچەڵێتیەیە .

**دووەم** : بەڕاستی ئەو هاوبەش ئەنجامدەرانە خۆیان دانیان بـەوەدا دەنـا کـەوا بـە تـەنها خـوای گـەورە پـەروەردگار و دروستـکارە و مـوڵکی هـەموو شتێك بە دەسـتی ئـەوە و ڕێگری دەکـات و ڕێگری لـێناکرێت ، ئەمـەش ناچارکارە بۆ ئەوەی کە یەکتـای بکەنەوە بە پەرستراوێـتی هـەروەکو چۆن یەکتایان کردووەتەوە بە پەروەردگارێتی ، وەك خوای گەورە فەرموویـەتی :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ [البقرة] .

واتە : ئەی خەڵکینە پەروەردگارەکـەتان بپەرستن کە ئێوە و ئەوانەی

---

(٣) یاخود ئەگەر شەریکی دەسەڵات دارەکەش نەبوو ، ئەوە یارمەتیدەر و جێگیر و ژێر دەست و وەزیری بێت .

(٤) یاخود کە ئەو مافەشی نەبوو ، مافی ئەوەی هەبێت کە داوا لە خاوەن سوڵتە بکات بۆ هـەر کەسێك و لـە هـەر کاتێکدا بێت.

بەڵام پەروەردگار لەم دوو ئایەتەی (سورەتی سبأ)دا ڕوونی کردووەتەوە کـە غـەیری خـوا هـەر چـەند پلەوپایەشـی بەرز بێت ، وەك پێغەمبەرانی نێردراوی خوا و فریشتەکانی لە خـوا نزیـك و پیاوچـاکانیش ، هـیچ کـام لـەم چـوار مافـەیان نیە و ناتوانن داوای شەفاعەتیش بکەن مەگەر خوا ئیزنیان بدات و شەفاعەتەکەش بۆ کەسێك بێت کە خوا ڕازی بێت بـە شەفاعەت کردن بۆی . بڕوانە کتێبی : (**خواپەرستی نەك شەخس پەرستی**) لاپەڕە : (٤١ ـ ٤٢) .

پێش ئێوەشی دروست کردووە بۆ ئەوەی لێی بترسن ـ بە ئەنجامدانی کردارە چاکە فەرمان پێکراوەکان و خۆپاراستن لە کردارە خراپە قەدەغەکراوەکان ـ ﴿٢١﴾ ئەو پەروەردگارەی کە زەوی ڕاخستوە و ئاسمانی بینا کردووە بۆتان و لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ هێناونەتە خوارەوە پاشان بەو ئاوە بەروبوومی بۆ دەرهێناون بۆ ئەوەی ببێت بە ڕزقی ئێوە ، کەواتە هاوشێواز و شەریك بۆ خوا دامەنێن لە پەرستندا چونکە ئێوە دەزانن خوا هاوشێواز و شەریکی نی‌یە و تەنها ئەوە بەدیهێنەر و ڕۆزیدەر و بەڕێوەبەری هەموو دروستکراوەکان .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾﴾ [الزخرف] .

واتە : ئەگەر پرسیار بکەیت لە هاوبەش ئەنجامدەرەکان ئایا کێ ئێوەی دروست کردووە ؟ بەدڵنیایی دەڵێن : خوا ، ئایا بۆ جگە لە خوا دەپەرستن و بە ناحەق شەریکی بۆ بڕیار دەدەن .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾﴾ [يونس] .

واتە : ئەی پێغەمبەر بە هاوبەش ئەنجامدەرەکان بڵێ : کێ ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمان و زەویدا ؟ ئایا کێ توانای بیستن و بینینی بەدەستە ؟ و کێ زیندوو لە مردوو دەهێنێتە دەرەوە و مردووش لە زیندوو دەهێنێتە

دەرەوە ؟ و کێ فەرمانڕەوایە و بوونەوەر بە ڕێوە دەبات ؟ ئەوانیش دەڵێن : خوا ، بڵێ : ئایا ئەی بۆ لە خوا ناترسن و خۆپارێزی ناکەن لە تاوان ﴿٣١﴾ ؟ ئەو خوایە پەروەردگاری حەقی ئێوەیە ، ئایا چ شتێك هەیە لە دوای حەق ئیللا گومڕایی نەبێت ؟ ئیتر بۆ خۆتان لادەدەن لە پەرستنی ئەو خوایە بە تەنها و جگە لە ئەو دەپەرستن کە هیچیان بە دەست نییە و هیچیان لە دەست نایەت ؟!

**بواری چوارەم کە باوەڕبوون بە خوای گەورە دەیگرێتەوە : باوەڕبوونە بە ناو و سیفەتەکانی :**

واتە : سەلماندنی ئەوەی کە خوا بۆ خۆیی سەلماندووە لە قورئاندا یان لە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) لە ناو و سیفەتەکان ، بەو شێوازەی کە شیاوە بۆ خوا بە بێ (تحریف) و (تعطیل) و (تکییف) و (تمثیل)[1].

---

[1] بۆ تێگەیشتن لەم زاراوانە پێویستە پێناسەیان بکەین، بۆیە بە کورتی دەڵێم :

ـ (**تحريف** : هو صَرفُ اللفظ عن معناهُ الظاهر إلى معنًى مَرجوح بغير دليل) .

واتە : (**تحریف**) بریتییە لە : گۆڕینی واتای ووشەکان لە مانا ڕاست و ڕواڵەتەکانیان بۆ واتایەکی دوور و نەگونجاو بە بێ بەڵگە .

ـ (**تعطيل** : هو عدم إثبات الصفات ، أو إثبات بعضها ونَفي الباقي) .

(**تعطیل**) بریتییە لە : نە سەلماندنی سیفاتەکانی خوا ، یان سەلماندنی هەندێکیان و نە سەلماندنی باقییەکەی .

ـ (**تكييف** : هو حكاية كيفية أو صورة ذات الله وصفاته) .

واتە : (**تکییف**) بریتییە لە : گێڕانەوەی چۆنێتی یان شێوەی خودی خوا و سیفاتەکانی .

ـ (**تمثيل** : هو إثبات المثل للشيء ، مُشتبهاً لـهُ من كُلِّ الوجوه) .

واتە : (**تمثیل**) بریتییە لە : سەلماندنی نموونە بۆ شتێك ، کە لە هەموو ڕوویەوە وەك یەك بن .

خـــوای گـــەورە فەرموویـــەتی : ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾ [الأعراف] .

**واتە : ناوە چاك و جوانەكان تەنها شایستەی خوان بۆیە بەو ناوانـە داوا لە خوا بكەن و بە خاتری ئەو ناوانـە لـە خـوا بپاڕێنـەوە و وازبێـنن لەوانـەی كەوا بێباوەڕ و لاڕێدەبن لە ناوەكانی خوادا ، ئەوانە پاداشتی كردەوەكانیـان وەردەگرنەوە .**

وە خوای گەورە فەرموویـەتی : ﴿وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢٧﴾ [الروم] .

**واتە : نموونەی بەرزی لە نێـو ئاسمانـەكان و زەویـدا تـەنها بـۆ خوایـە و ئەویش بەدەسەڵات و دانایە .**

وە خـــوای گـــەورە فەرموویـــەتی : ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ [الشورى] .

**واتە : هیچ شتێك وەكو خوا نییە و خواش بیسەر و بینەرە .**

---

سودێك : هەروەها (ئـەهلی سـوننە و جەماعـە) نـاو و سـیفاتەكانی خـوا پـاكڕادەگرن لـە (**تشبيه**) و (**تفويض**)یش ، كە ئەمە پێناسەكەیانە :

ـ (**تشبيه** : هو إثبات المثل للشيء ، مُشتبهاً لـهُ من بعض الوجوه) .

واتە : (**تشبيه**) بریتییە لە : سەلماندنی نموونە بۆ شتێك ، كـە لـە هەنـدێك ڕووەوە وەك یەك بن .

ـ (**تفويض** : هو إثبات مُجرد اللفظ ، وتفويض العلم بِمعناه إلـى الله وحده).

واتە : (**تفويض**) بریتییە لە : سەلماندنی خودی ووشەكان بە تەنها و گێڕانەوەی زانینی واتاكانیان بۆ لای خوا بە تەنها .

*** وە لەم بوارەدا دوو تاقم گومڕا بوون :**

**یەکـەمینیان** : (المعطلة[*] / نەسەلمێنەرەکان)ن ، ئەوانەی کەوا ئینکاری هەموو ناو و سیفەتەکانی خوا دەکەن یان ئینکاری هەندێکیان دەکەن و باوەڕیان پێیان نییە ، چونکە بۆچوونیان وایە کەوا سەلماندنی ناو و سیفەتەکان ناچارکارە بۆ وێکچواندن (التشبیه) ، واتە : وێکچواندنی خوای گەورە بە دروستکراوەکانی ، ئەم بۆچوونەش پوچەڵە لە چەند ڕوویەکەوە ، لەوانە :

**یەکەم** : بەڕاستی ئەم بۆچوونە ناچارکارە بۆ چەندین ناچارکاری تری پوچەڵ (یستلزم لوازم باطلة) ، وەکو هەبوونی نەسازی (تناقض) لە نێو کەلامی خوای پاك و بێکەموکوڕیدا ، چونکە خوای گەورە ناو و سیفاتی بۆ خۆی سەلماندووە و ئەوەشی ڕەدکردووەتەوە کەوا هیچ شتێك وەکو ئەو بێت (أنّ الله أثبت لنفسه الأسماء والصفات ، ونفى أنْ یکون کمثله شيء) ، جا ئەگەر سەلماندنیان ناچارکار ببوایە بۆ وێکچواندن ، ئەوا ناچارکار دەبوو بۆ نەسازی (تناقض) لە نێو کەلامی خوادا ، وە هەندێکی تری بە درۆ دەخستەوە ـ ئەمەش مەحاڵە ـ.

**دووەم** : بەڕاستی ڕێکەوتنی دوو شت لە ناودا یان لە سیفەتدا ناچارکار نییە بۆ ئەوەی کەوا وەکو یەك بن ، چونکە تۆ دەبینیت دوو کەس

---

[*] (**المعطلة**) بەرامبەرەکەی لە زمانی کوردیدا بریتییە لە : (**پەککەرەکان**) واتە : ئەوانەی کە دەقەکانی قورئان و سوننەت پەکدەخەن و واتاکانیان ناسەلمێنن ، کەواتە مەبەست لە لای ئەم تاقمە گومڕایە نەسەلماندنی واتای ئەو دەقانەیە کەوا سەبارەت بە ناو و سیفەتەکانی خوای گەورەوە هاتوون ، بۆیە بە واتایەکی تر دەتوانین پێیان بڵێین : (**نەسەلمێنەرەکان**) ، چونکە (پەکخستن) دەرئەنجامەکەی (نەسەلماندن)ـە .

رێكدەكەون لەوەدا كە هەردووكیان مرۆڤن و بیسەرن و بینەرن و قسە دەكەن ، ئەمەش ناچاركار نیيە بۆ ئەوەی كەوا هەردووكیان وەكو يەك بن لە ماناكانی مرۆڤايەتی و بيستن و بينين و قسە كردندا ، وە دەبينيت زيندەوەرەكان (الـــحيوانات) دەست و پێ و چاويان هەيە ، وە ئەم رێكەوتنەش ناچاركار نیيە بۆ ئەوەی كە دەست و پێ و چاوەكانيان وەكو يەك بن .

جا ئەگەر دەركەوت كە جياوازی هەيە لە نێو دروستكراوەكاندا لەو شتانەدا كەوا تێيدا رێكدەكەون لە ناوەكاندا يان لە سيفەتەكاندا ، ئەوا جياوازی لە نێوان دروستكار و دروستكراودا ڕوون تر و گەورە ترە .

**تاقمی دووەميان** : (الـــمشبهة* / وێكچوێنەرەكان)ن ، ئەوانەی كەوا ناو و سيفەتەكانی خـوا دەسەلمێنن لەگەڵ وێكچواندنی (شوبهاندنی) خـوای گەورە بە دروستكراوەكانیيەوە ، چونكە بۆچوونيان وايە كەوا ئەمە داخوازيكاری بەڵگەخوازی دەقەكانە (زاعمين أنَّ هذا مُقتضَى دَلالة النصوص) ، چونكە خوای گەورە بەوە دەدوێت لەگەڵ بەندەكانيدا كە لـێی تێبگەن ، ئەم بۆچوونەش پوچەڵە لە چەند ڕوويەكەوە ، لەوانە :

**يەكـەم** : بەڕاستی لەيەكچوونی خـوای گەورە بە دروستكراوەكانی شتێكە عەقڵ و شەرع پوچەڵی دەكەنەوە ، وە ناشكرێت و مەحاڵە كەوا داخوازيكاری (مُقتضَى) دەقەكانی قورئان و سوننەت شتێكی پوچەڵ بێت .

---

* (**المشبهة**) بەرامبەرەكەی لە زمانی كورديدا بريتیيە لە : (**وێكچوێنەرەكان**) واتە : ئەوانەی كە سيفەتەكانی خوای گەورە دەشوبهێنن بە سيفەتی دروستكراوەكانی ، مەبەست لە لای ئەم تاقمە گومرايە سەلماندنی واتای ئەو دەقانەيە كەوا سەبارەت بە ناو و سيفەتەكانی خوای گەورەوە هاتوون لەگەڵ شوبهاندنی بە سيفەتی دروستكراوەكان .

**دووەم** : بەڕاستی خوای گەورە دواوە لەگەڵ بەندەکانیدا بەوەی کە لێی تێدەگەن لە ڕووی بنچینەی واتاوە (أصل المعنى) ، بەلاّم (الحقیقة والكُنه) حەقیقەت و خود و ناوەڕۆك کەوا ئەو واتایەی لەسەر وەستاوە ، ئەوا ئەمەیان لەو شتانەیە کە خوای گەورە زانینی تایبەت کردووە بە خۆیەوە لەوەدا کە پەیوەندی هەیە بە خودی خوا و سیفەتەکانیەوە (ذاتهِ وصفاتهِ) .

جا ئەگەر خوا سەلماندی بۆ خۆی کەوا بیسەرە ، ئەوا بیستن زانراوە لە ڕووی بنچینەی واتاوە (کە هەست کردنە بە دەنگەکان) ، بەلاّم حەقیقەت و خودی ئەوە بە نیسبەت بیستنی خوای گەورەوە نەزانراوە ، چونکە حەقیقەت و خودی بیستن جیاوازە تەنانەت لە نێوان زیندەوەرەکانیشدا ، کەواتە جیاوازی تێیدا لە نێوان دروستکار (خالق) و دروستکراو (مَخلوق)دا ڕوون تر و گەورە ترە .

وە ئەگەر خوای گەورە هەواڵیدا سەبارەت بە خۆی کەوا بەرزبووەتەوە* بەسەر عەرشەکەیدا (استوى على عرشهِ) ، ئەوا بەڕاستی (الاستواء) لە ڕووی بنچینەی واتاوە زانراوە ، بەلاّم حەقیقەت و خودی (الاستواء) کەوا ئەو واتایەی لەسەر وەستاوە بۆ ئێمە نەزانراوە بە نیسبەت بەرزبوونەوەی خوادا بەسەر عەرشەکەیدا (استواء الله على عرشهِ) ، چونکە حەقیقەت و خودی بەرزبوونەوە (الاستواء) جیاوازە لە ئاستی دروستکراودا ، بەرزبوونەوە بەسەر تەختێکی دامەزراودا وەکو بەرزبوونەوە نییە بەسەر کۆپانی وشترێکی ناڕەحەتی هەڵچودا ، جا ئەگەر بەرزبوونەوە (استواء)

---

* [بڕوانە : فتح الباري شرح صحيح البخاري : (١٣ / ٤٩٣)] .

جیاواز بێت له ئاستی دروستکراودا ، ئەوا جیاوازی تێیدا له نێوان دروستکار و دروستکراودا ڕوون تر و گەورە تره .

وه **باوەڕبوون به خـوای گـەوره** بـەو شـێوازەی کـه باسمـان کـرد چـەندین بەرهەمی گەوره بۆ باوەڕدار بەرهەم دێنێت ، لەوانه :

**یەکەم** : بەدیهێنانی یەکتاپەرستی خوای گەوره ، بـه شـێوەیەك کـەوا نه ئومێدپێبوون و نه ترسانی پەیوەست ببێت به جگه له خواوه ، وه جگـه له خواش نەپەرسترێت .

**دووەم** : کاملێتی خۆشەویستی خوای گەوره و به گەورەدانانی به پـێی داخوازیکاری ناوه جوانەکانی و سیفاته بەرزەکانی .

**سێیەم** : بـەدیهێنانی پەرسـتنی خـوای گـەوره بـه جێبـەجێ کردنـی ئـەوەی کـه فـەرمانی پـێکردووه ، وه بـه دوور کەوتنـەوه لـەوەش کـه لەدەغەی کردووه .

# باوەڕبوون بە فریشتە

فریشتە : جیهانێکی نادیارن ، دروستکراون ، بەندایەتی دەکەن بۆ خوای گەورە و دەیپەرستن ، هیچ تایبەتمەندێتی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتیان نیيە ، خوای گەورە دروستیانی کردووە لە روناکی (نور) ، وە پابەندبوونی تەواو و توانای جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پێبەخشیون .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾﴾ [الأنبياء] .

واتە : ئەو فریشتانەی کە لای خوای گەورەن خۆیان بەگەورەدانانێن لە پەرستنیدا و ماندوویش نابن ﴿١٩﴾ بە شەو و بە ڕۆژ بەردەوام تەسبیحاتی دەکەن بە بێدابڕان .

فریشتەکان ژمارەیان زۆرە ، کەس ناتوانێت بیانژمێرێت تەنها خوای گەورە نەبێت .

لە هەردوو (صحيح البخاري ومسلم)دا لە فەرموودەی (أنس)ەوە (ﷺ) لە بەسەرهاتی (بەرزبوونەوەی پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئاسمان / قصة المعراج) هاتووە : کەوا پێغەمبەر ﷺ ماڵی ئاوەدانکراوەی (البيت المعمور) لە ئاسماندا بۆ بەرز کرایەوە بینی هەموو ڕۆژێك (٧٠٠٠٠) حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تێدا دەکات ، ئەگەر دەرچوون تێیدا ناگەڕێنەوە بۆی تا دوا دانەیان[٧] .

---

[٧] رواه البخاري ، كتاب فضائل الصحابة ، باب المعراج ، رقم : (٣٦٧٤) ، ورواه مسلم ، كتاب الإيمان ، باب الإسراء برسول الله ﷺ إلى السماوات وفرض الصلوات ، رقم : (٤٠٩) .

*** وه باوەڕبوون بە فریشتە چوار بوار دەگرێتەوە :**

**یەکەم** : باوەڕبوون بە هەبوونیان .

**دووەم** : باوەڕبوون بەوانەیان کە ناویان دەزانین بە ناوەکانیانەوە وەکو (جبریل) ، وە ئەوانەشیان کە ناوەکانیان نازانین باوەڕمان پێیان هەیە بە گشتی .

**سێیەم** : باوەڕبوون بەوەی کە دەیزانین لە سیفەتەکانیان ، وەکو سیفەتی (جبریـــل) کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بەوەی کەوا بینیویەتی لەسەر ئەو سیفەت و شێوازەی کە دروست کراوە لەسەری کەوا (٦٠٠) شەسەد باڵی هەبووە بەری ئاسۆی گرتبوو .

وە هەندێك جار فریشتە بە فەرمانی خوا دەگۆڕێت و دەچێتە سەر شێوازی پیاو ، هەروەکو چۆن روویدا بۆ (جبریـــل) کاتێك کە خوای گەورە ناردی بۆ لای (مەریەم) کەوا خۆی نواند بۆی لە شێوەی مرۆڤێکی رێك و کامڵدا ، وە کاتێك کە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە دانیشتبوو لە نێو هاوەڵەکانیدا ، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە شێوەی پیاوێکی جل و بەرگ زۆر سپی و موو زۆر ڕەش ، کەوا شوێنەواری سەفەر کردنی پێوە نە دەبینرا ، و کەسیش لە هاوەڵان نەیدەناسی ، ئەنجا لە لای پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشت و هەردوو ئەژنۆی دایە پاڵ هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەرەوە ، و هەردوو لەپی خستە سەر هەردوو ڕانییەوە ، وە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە ئیسلام و ئیمان و ئیحسان و ڕۆژی دوایی و نیشانەکانی ، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوە و ڕۆیشت ، ئەنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەمە (جِبْرِيل) بوو هات بۆ لاتان بۆ ئەوەی ئاینەکەتانتان فێر بکات[٨].

---

[٨] رواه مسلم ، كتاب الإيمان ، باب الإيمان والإسلام والإحسان ، رقم : (٩٣) .

بڕوانە کتێبی : (سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان) لاپەڕە : (٢٧ ـ ٢٩) .

هەروەها ئەو فریشتانەش کە خوای گەورە ناردیانی بۆ لای (إبراهیم ولوط) لەسەر شێوەی پیاوان بوون .

**بواری چوارەم کە باوەڕبوون بە فریشتە دەیگرێتەوە :**

باوەڕبوونە بەوەی کە دەیزانین لە کردەوەکانیان کە پێیهەڵدەسن بە فەرمانی خوای گەورە ، وەکو تەسبیحات کردنی و پەرستن بۆی بە شەو و بە ڕۆژ بە بێ ماندوو بوون و دابڕان .

وە هەندێکیان کردەوەی تایبەتی خۆیان هەیە .

وەکو : (جِبْرِيل الأمين على وحي الله) : واتە سەرپەرشتیار بەسەر سروشی (وحي) خوای گەورەوە ، خوا سروشی پێدا دەینێرێت بۆ (الأنبياء والرسل) هەواڵپێدراو و نێردراوانی .

وە (ميكائيل الموكل بالقطر والنبات) : واتە ڕاسپاردەکراو بە باران و ڕووەك .

وە (إسرافيل الموكل بالنفخ في الصور) : واتە ڕاسپاردەکراو بە فووکردن بە کەڕەنادا لە کاتی هاتنی قیامەت و زیندووبوونەوەی دروستکراوەکاندا .

وە (مَلَك المَوت الموكل بقبض الأرواح) : واتە فریشتەی گیان کێشان کە ڕاسپاردەکراو بە دەرهێنانی گیانەکان لە کاتی مردندا .

وە (مالِك الموكل بالنار) : واتە ڕاسپاردەکراو بە ئاگر ، کە بەرپرسی دۆزەخە .

وە (الملائكة الموكلين بالأجِنَّة في الأرحام) : واتە فریشتە ڕاسپاردەکراوەکان بە کۆرپەلەکان لە مناڵدانی دایکدا ، کاتێك کە مرۆڤـ

چوار مانگ تەواو دەکات لە سکی دایکیدا خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت و فەرمانی پێدەکات بە نووسینی ڕۆزیی و ماوەی تەمەنی و کردەوەی و بەدبەختیی یان بەختەوەریی .

وە (الملائكة الموكلين بِحفظ أعمال بني آدم) : واتە فریشتە ڕاسپاردەکراوەکان بە چاودێری و پارێزگاری کردن لە کردەوەی ئادەمیزادەکان و تۆمار کردن و نووسینەوەیان ، هەموو مرۆڤێك دوو فریشتەی هەیە ، یەکێکیان لای ڕاستیدایە و دووەمیشیان لای چەپیدایە .

وە (الملائكة الموكلين بسؤال الميت) : واتە فریشتە ڕاسپاردەکراوەکان بە پرسیار کردن لە مردوو لە کاتێکدا کە دەخرێتە گۆڕەوە ، دوو فریشتە دێن بۆ لای ، پرسیاری لێدەکەن سەبارەت بە پەروەردگاری و ئاینی و پێغەمبەری * .

وە **باوەڕبوون بە فریشتە** چەندین بەرهەمی گەورە بەرهەم دێنێت ، لەوانە :

**یەکەم** : زانینی گەورەیی و توانا و دەسەڵاتی خوای پایەبەرز ، چونکە بەڕاستی گەورەیی دروستکراو (المخلوق) بەڵگەیە لەسەر گەورەیی دروستکار (الخالق) .

**دووەم** : سوپاس کردنی خوای پایەبەرز لەسەر بایەخدانی بە ئادەمیزاد ، کەوا هەندێك لەو فریشتانەی ڕاسپاردووە بەوەی کە هەستن بە پاراستنیان ، وە تۆمار کردن و نووسینەوەی کردەوەکانیان ، وە جگە لەمانەش لە

* بڕوانە کتێبی : (سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان) لاپەڕە : (٤٢ - ٥٦) .

بەرژەوەندیەكانیان .

**سێیەم :** خۆشویستنی فریشتەكان لە بەرامبەر ئەوەی كەوا پێیهەڵدەسن لە پەرستنی خوای گەورەدا .

* وە **خەڵكانێك لە لاڕێیووان** نكوڵی (ئینكاری) ئەوە دەكەن كەوا فریشتە بەرجەستەن ، وە دەڵێن : فریشتە بریتین لە توانای چاكەكاری كە لە ناخی دروستكراوەكاندا هەن ، وە ئەمەش بە درۆ خستنەوەیە بۆ كتێبەكەی خوای گەورە و فەرموودەی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) و كۆڕا و یەكدەنگی موسڵمانان .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾ [فاطر] .

واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە دروستكاری ئاسمانەكان و زەویە و فریشتەكانی كردووە بە نێردراوی خاوەن باڵی دوانی و سیانی و چواری و لە دروستكراوەكاندا زیاد دەكات ئەوەندەی ویستی لێبێت ، بەڕاستی خوا بە توانایە بەسەر هەموو شتێكدا .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۙ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾﴾ [الأنفال] .

واتە : وە ئەگەر ببینیت لە كاتێكدا كە فریشتەكان ئەوانەی بێباوەڕبوون دەمرێنن و دەدەن لە ڕوومەتیان و دواوەیان و پێیان دەڵێن : بیچێژن سزای سوتێنەر .

وه خــوای گــه‌وره فه‌رموویــه‌تی : ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ﴿٩٣﴾﴾ [الأنعام] .

واته : وه ئه‌گه‌ر ببینیت له كاتێكدا كه سته‌مكاره‌كان لـه ناڕه‌حـه‌تی و ناهه‌مواریـه‌كانی سـه‌ره‌مه‌رگدان و فریـشته‌كان باڵـه‌كانیان ڕاخـستووه بـۆ لێدانیان تـاوه‌كو گیانیـان بێتـه‌ده‌ره‌وه و پێیـان ده‌ڵـێن : گیانتـان بهێننـه ده‌ره‌وه .

وه خــوای گــه‌وره فه‌رموویــه‌تی : ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾﴾ [سبأ] .

واته : له كاتێكدا كه ترس لاده‌چێت له‌سه‌ر دڵی فریشته‌كـان ده‌ڵێن : ئـه‌وه په‌روه‌ردگارتان چی فه‌رموو ؟ ده‌ڵێن : حه‌ق و ڕاستی فه‌رموو ، وه خوا به‌رز و گه‌وره‌یه .

وه خــوای گــه‌وره ســه‌باره‌ت بــه خــه‌ڵكی به‌هه‌شــت فه‌رموویــه‌تی : ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾﴾ [الرعد] .

واته : وه فریشته‌كان له هـه‌موو ده‌رگایه‌كـه‌وه ده‌چنه ژووره‌وه بۆ لای باوه‌ڕداره‌كان له به‌هه‌شتدا ﴿٢٣﴾ پێیان ده‌ڵێن : سـه‌لامی خواتـان له‌سـه‌ر بێـت لـه به‌رامبـه‌ر ئـه‌وه‌دا كـه لـه دونیـادا ئارامتـان گـرت ، ئـه‌م ماڵـه باشـترین سه‌رئه‌نجامه .

وه لـه (صحيح البخـــاري)دا هـاتووه لـه (أبــــي هريـــرة)وه (ﷺ) لـه پێــغه‌مبه‌ره‌وه (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : «إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّــهَ يُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحْبِبْهُ . فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ ، فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ

فُلاَنًا فَأَحِبُّوهُ ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الأَرْضِ»[٩] .

واتە : ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆشویست بانگی جبریل دەکات و دەفەرموێت : بەڕاستی خوا فلآنە کەسی خۆشدەوێت تۆیش خۆشت بوێ ، (جبریل)یش خۆشی دەوێت ، ئەنجا (جبریل) بانگ دەکات لە نێو خەڵکی ئاسماندا و دەفەرموێت : بەڕاستی خوا فلآنە کەسی خۆشدەوێت ئێوەش خۆشتان بوێت ، ئەنجا خەڵکی ئاسمانیش خۆشیان دەوێت ، پاشان پەسەند کردنی لە لای خەڵکەوە بۆ دادەنرێت لەسەر زەویدا .

هەروەها تێیدا هاتووە لە (أبي هريرة)وە (ﷺ) فەرموویەتی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : «إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ الْمَلاَئِكَةُ ، يَكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ ، فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ»[١٠] .

واتە : ئەگەر ڕۆژی جومعە بوو لە پێش هەموو دەرگایەك لە دەرگاکانی مزگەوتدا فریشتە هەیە یەکەمین کەس و ئەوەی بە دوایدا دێت بۆ مزگەوت دەنووسن ، جا ئەگەر پێشنوێژ دانیشت ئەوان تیانووسەکانیان دەپێچنەوە و دێن گوێدەگرن بۆ زیکرەکە .

[٩] رواه البخاري ، كتاب بدء الخلق ، باب ذكر الملائكة ، رقم : (٣٠٣٧) .

[١٠] رواه البخاري ، كتاب بدء الخلق ، باب ذكر الملائكة ، رقم : (٣٠٣٩) .

## باوەڕبوون بە کتێبەکان

کتێبەکان (الکُتُب) کۆی کتێبە (کتاب) بە واتای نووسراو (مکتوب) .

وە مەبەست پێی لێرەدا : ئەو کتێبانەیە کە خوای گەورە دایبەزاندوون بۆ سەر پێغەمبەرانی لە بەزەیی هاتنەوەیدا بە دروستکراوەکانی ، بۆ ئەوەی ببێت بە ڕێنمایی بۆیان ، تاوەکو بە هۆیەوە بگەن بە بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ .

*** وە باوەڕبوون بە کتێبەکان چوار بوار دەگرێتەوە :**

**یەکەم** : باوەڕبوون بەوەی کە بەڕاستی دابەزینیان لە لایەن خواوەیە .

**دووەم** : باوەڕبوون بەوانەیان کە ناویان دەزانین بە ناوەکانیانەوە وەکو (القرآن) کە دابەزیوە بۆ سەر (مُحمَّد ﷺ) ، وە (التوراة) کە دابەزیوە بۆ سەر (مُوسى ﷺ) ، وە (الإنـــجيل) کە دابەزیوە بۆ سەر (عيسى ﷺ) ، وە (الزَّبور) کە دراوە بە (داود ﷺ) ، بەڵام ئەوانەیان کە ناوەکانیان نازانین ئەوا باوەڕمان پێیان هەیە بە گشتی .

**سێیەم** : بە ڕاست دانانی ئەوەی کە (صحیح)ـە لە هەواڵەکانیان ، وەکو هەواڵەکانی قورئان ، وە ئەو هەواڵانەش کە نەگۆڕاون یان دەستکاری نەکراون لە کتێبەکانی پێشوو .

**چوارەم** : کردەوە کردن بەو حوکمانەی کە هەڵنەوەشێنراونەتەوە تێیاندا ، وە ڕازی بوون و ملکەچ بوون پێیان ئەگەر لە مەبەستەکانیان تێبگەین یان تێنەگەین یەکسان بێت بە لامانەوە ، وە هەموو کتێبە پێشووەکان هەڵوەشێنراونەتەوە بە قورئانی گەورە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ

وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴿٤٨﴾ [المائدة] .

واتە : ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆ تۆ بە حەق و ئەو کتێبانەی پێش خۆی بەڕاست دەخاتەوە و یەکلاکەرەوەشە بەسەریاندا .

بە پێی ئەمە دروست نییە کردەوە بکرێت بە هیچ حوکمێك لە حوکمەکانی کتێبەکانی پێشوو تەنها ئەوانەیان نەبێت کە ڕاستن و قورئانیش هێشتونێتەوە .

وە **باوەڕبوون بە کتێبەکان** چەندین بەرهەمی گەورە بەرهەم دێنێت ، لەوانە :

**یەکەم** : زانینی بایەخدانی خوای گەورە بە بەندەکانی کەوا بۆ هەموو گەلێك کتێبێکی دابەزاندووە بۆ ئەوەی ڕێنماییان بکات پێی .

**دووەم** : زانینی دانایەتی خوای گەورە لە بەرنامە (شەرعە)کەیدا ، کەوا بۆ هەموو گەلێك بەرنامەیەکی داڕشتووە کە گونجاو بێت لەگەڵ بار و حاڵیاندا ، هەروەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴿٤٨﴾﴾ [المائدة] .

واتە : بۆ هەر گەلێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێبازێکمان داناوە .

**سێیەم** : سوپاس کردنی نیعمەتەکانی خوا لەمەدا .

# باوەڕبوون بە پێغەمبەران

پێغەمبەران* (الرُّســـل) کۆی پێغەمبـەرە (رســـول) بـە واتـای نێردراو (مُرسَل) واتە نێردراو بە گەیاندنی شتێك .

وە مەبەست پێی لێرەدا : ئەو کەسەیە کەوا سروشـی بـۆ کـراوە (أوحِيَ إليە) لە مرۆڤدا بە شـەریعەتێك و فـەرمانیشی پـێکراوە بە گەیاندنی** .

---

* **تێبینی** : وشەی (پێغەمبەر) لە (پەیام + بەر)ەوە هاتووە ، چونکە (رسول) ئەو کەسەیە کە پەیامێکی پێیە لە کەسێکەوە و دەیگەیەنێت بە کەسێك یان کەسانێکی تر ، بەڵام لەبەر زۆری بـەکارهێنانی وشـەی (پـەیام + بەر) بووە بە (پێغەمبەر) . (وەرگێڕ) .

** **دوو تێبینی تر** :

**یەکەم** : جیاوازی نێوان (نبـي) و (رسول) :

النَّبي : رجلٌ أوحى اللهُ إليه وأمرهُ بتبليغ شريعة رسولٍ قبلهُ .

**واتـە : هەواڵپێـدراو : پیاوێکـە خـوا وەحیـی بـۆ نـاردووە و فـەرمانی پـێکردووە بـە گەیانـدنی شەریعەتی پێغەمبەرێکی پێش خۆی .**

الرَّسول : رجلٌ أوحى اللهُ إليه وأنزل عليه شريعةً وأمرَهُ بتبليغها .

**واتە : نێردراو : پیاوێکە خوا وەحیی بـۆ نـاردووە و شـەریعەتێکی بـۆ دابەزانـدوو و فەرمانیـشی پێکردووە بە گەیاندنی .**

قال رسول الله (ﷺ) : ((إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ يَدُلَّ أُمَّتَهُ عَلَى خَيْرِ مَا يَعْلَمُهُ لَهُـمْ وَيُنْذِرَهُمْ شَرَّ مَا يَعْلَمُهُ لَهُمْ ...)) [صحيح مسلم رقم : (١٨٤٤) وسلسلة الأحاديث الصحيحة رقم : (٢٤١)] .

**واتە : بەڕاستی هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە پێش من ئیللا پێویست بووە لەسەری کـەوا ڕێنمـایی نەتەوەکەی بکات بۆ هەموو چاکەیەك کە دەیزانێت بۆیـان ، وە ئاگاداریـانی کردووەتـەوە لـە هـەموو خراپەیەك کە دەیزانێت بۆیان .**

**سودێك** : قال الإمام الألبانـي رحمه الله مُعلقاً على هذا الـحديث : (وفي الـحديث فوائدُ كثيرة ، مـن اهمها انَّ النبيَّ يَجبُ عليه انْ يدعو أُمَّتَهُ إلى الـخير ، ويدلَّهم عليه ، وينذرهم شر ما يعلمهُ لهم ، ففيه ردٌّ صريح على ما ذُكِرَ في بعض كتب الكلام انَّ النبيَّ : مَـنْ أُوحِيَ إليه ولَمْ يُؤمر بالتبليغ) السلسلة : (١ / ٤٨٦) .

**واتە : ئەم فەرموودەیە سودی زۆری تێدایە ، گرنگترینیان ئەوەیە : کە بەڕاستی هەواڵپێـدراویش (النَّبي) پێویستە لەسەری بانگەوازی نەتەوەکەی بکات بۆ چاکە و ڕێنماییـان بکـات بـۆی و ئاگاداریـان بکاتەوە لەو خراپانەی کە دەیزانێت بۆیان ، ئەمەش بەرپەرچدانەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەوەی**

وە (نوح) یەکەمین *** پێغەمبەرە (علیە السلام) ، و (مُحَمَّـــد)یش (ﷺ) دوایین پێغەمبەرە (ﷺ) .

---

کە باس کراوە لە هەندێك کتێبەکانی (کەلامدا) کەوا هەواڵپێدراو (النبي) : ئەو کەسەیە کە وەحیی بۆ هاتووە و فەرمانی پێنەکراوە بە گەیاندنی .

ئەم پێناسەیە هەڵەیە ! چونکە هەواڵپێدراویش (النبي) فەرمانی پێکراوە بە گەیاندن ، بەڵام شەریعەتی بۆ نەهاتووە و شەریعەتی پێغەمبەرێکی (رسول) پێش خۆی یان شەریعەتی پێغەمبەرێکی تر کە لەگەڵیدایە دەگەیەنێت .

**دووەم** : پێویستە ئەوە بزانرێت کەوا هەموو پێغەمبەران پیاو بوون ، بۆیە هیچ پێغەمبەرێك لە ئافرەتان نەهاتووە بە بەڵگەی ئەم ئایەتە : ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴿٤٣﴾﴾ [النحل] .

واتە : ئەی (مُحمَّد) لە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیللا پیاوانێك نەبێت کە سروش (وەحیی)مان بۆ ناردوون .

کەواتە هاتنی سروش (وەحیی) بۆ هەندێك ئافرەت وەکو لە قورئاندا باس کراوە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کەوا ئەو ئافرەتانەش پێغەمبەر بن .

بۆ نموونە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ فَإِذَا خِفۡتِ عَلَيۡهِ فَأَلۡقِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحۡزَنِيٓۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧﴾﴾ [القصص] .

واتە : سروش (وەحیی)مان نارد بۆ دایکی (موسی) وتمان : شیری بدەرێ ، وە ئەگەر ترست هەبوو لەسەری ئەوا فرێی دەرە ناو دەریاکەوە و نە ترست هەبێت و نەخەمیش بخۆ ، چونکە بەڕاستی ئێمە دەیگێڕینەوە بۆت و دەیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەران .

*** نوح سەلامی خوای لەسەر بێت یەکەم پێغەمبەرە ڕەوانە کرابێت [دوای ڕوودانی هاوبەشدانان بۆ خوا لەسەر زەویدا]* بە بەڵگەی قورئان وسوننەت .

* ئەم بەندە پێویستە ، چونکە باوکە ئادەم لەم باسە بەدەرە لە بەر ئەوەی ئادەم - سەلامی خوای لێبێ - یەکەم پێغەمبەرە ڕەوانە کرابێت بۆ نەوەکانی بۆ ئەوەی شەریعەتی خوایان پێڕابگەیەنێت و فێری چۆنێتی خواپەرستیان بکات ، ئەنجا نەوەکانی بەردەوام بوون لە سەر خواپەرستی بە تەنها تا نەوەی دەیەم وەك (ابن عباس) دەفەرموێت : (کان بین آدم ونوح عشرة قرون کلهم علی التوحید) واتە : کۆمەڵگەی ئادەمیزاد هەر لە ئادەمەوە تا سەردەمی نوح هەموویان خواپەرست بوون و شیرك ئەنجامدان نەبوو .

-

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ (١٦٣)﴾ [النساء] .

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئێمە سرووش (وەحیی)مان ناردووە بۆ تۆ هەر وەکو چۆن سرووش (وەحیی)مان ناردووە بۆ (نوح) و پێغەمبەرانی دوای ئەو .

وە لە (صحيح البخاري)دا هاتووە لە (أنس بن مالك)ەوە (رضي الله عنه) لە فەرموودەی تکاکردن (الشَّفاعة)دا کەوا پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەوەی کردووە کە خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا دەڕۆن بۆ لای ئادەم بۆ ئەوەی تکایان بۆ بکات لای خوا ، ئەویش بیانویان بۆ دێنێتەوە کە ئەو ناتوانێت تکایان بۆ بکات و پێیان دەفەرموێت : ((ائْتُوا نُوحًا أَوَّلَ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ))[11] .

---

ئەنجا دوای ئەوەی شیرك ئەنجامدان سەری هەڵدا ـ بە هۆی زیادەڕەوی کردن لەو پێنج پیاوچاکەدا کە لە ئایەتی (٢٣)ی (سورة نوح)دا باس کراون ـ خوای گەورە پێغەمبەر نوحی ڕەوانە کرد بۆیان بۆ ئەوەی بانگەوازی خواپەرستیان پێڕابگەیەنێت و ڕێگریان لێبکات لە شیرك .

شێخ (ابن باز ـ ڕەحمەتی خوای لێبێ ـ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی : (هەموو پێغەمبەران نێردراون بۆ ئوممەتەکانیان موژدەدەر و ووریاکەرەوەیان بوون ، لە یەکەمیانەوە تا دواهەمینیان ، یەکەمیان (نوح)ە خوا ناردوویەتی بۆ قەومەکەی کاتێك شیرك تێیاندا ڕوویدا ، وە لە پێشیەوە ئادەم بوو کە بەڕاستی ئەویش هەواڵ پێدراو (نبي) و نێردراو (رسول) و ئەرکی گەیاندنیشی لەسەر بووە ، خوا ناردویەتی بۆ نەوەکەی بۆ ئەوەی خوا بپەرستن بەو شەریعەتەی کە باوکە ئادەمیان پێی هاتبوو درود و سەلامی خوای لێبێ ، ئەوانیش بەردەوام بوون لەسەر ئیسلام و ڕێگای ڕاست تاوەکو شیرك ڕوویدا لە نێو قەومەکەی نوح دا درود و سەلامی خوای لێبێ ، پاشان کاتێك شیرك ڕوویدا لە نێو قەومەکەی نوح دا خوای گەورە نوحی بۆ ڕەوانە کردن درود و سەلامی خوای لێبێ ، کەواتە نوح یەکەم پێغەمبەرە خوا ناردویەتی بۆ خەڵکی سەر زەوی دوای ڕودانی شیرك).

بڕوانە : (شرح ثلاثة الأصول) للشيخ ابن باز لاپەڕە : (٧٢) .

[11] رواه البخاري ، كتاب الرقاق ، باب صفة الجنة والنار ، رقم : (٦٥٦٥) .

واتە : بڕۆن بۆ لای (نوح) یەکەم پێغەمبەرە خوا ناردویەتی .

وە خوای گەورە سەبارەت بە (مُحَمَّد ﷺ) فەرموویەتی : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴿٤٠﴾ ﴾ [الأحزاب] .

واتە : (مُحَمَّد ﷺ) باوکی هیچ یەکێك لە پیاوانی ئێوە نەبووە ، بەڵکو پێغەمبەری خوا و کۆتایی پێهێنەری هەموو هەواڵپێدراوانی (پێغەمبەرانی) خوایە .

وە هیچ نەتەوەیەك (ئوممەتێك) نەبووە (نێردراو / رسول) پێغەمبەرێکی تێدا نەبووبێت کە خوای گەورە ناردبێتی بە شەریعەتێکی سەربەخۆ بۆ گەلەکەی ، یان هەواڵپێدراوێك (نَبِـــي) کە خوا وەحیی بۆ ناردووە بە شەریعەتی پێغەمبەرێکی پێش خۆی بۆ ئەوەی نوێی بکاتەوە بۆیان .

خـوای گـەورە فەرمووێـەتی : ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾ [النحل] .

واتـە : بـەدڵنیایی لـە هـەموو ئوممـەتێك (کۆمەڵـە مرۆڤـێك)دا پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆ ئەوەی پێیان بڵێ : بە تاك و تەنها خوای گەورە بپەرستن و خۆتان دوور بخەنەوە لە تاغوت (پەرستنی جگە لە خوا) .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾ [فاطر] .

واتە : هیچ ئوممەتێك نەبووە ئیللا پێغەمبـەرێکی ئاگادارکـەرەوەی تێدا بووە .

وە خوای گـەورە فـەرموویـەتی : ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ ﴿٤٤﴾﴾ [المائدة] .

واته : ئێمه (تەورات)مان دابەزاندووه رێنمایی و روناکی تێدایه ئەو هەواڵپێدراوانەی (پێغەمبەرانەی) کە موسڵمان و ملکەچبوون بۆ خوا فەرمانڕەوایی پێدەکەن بەسەر ئەوانەدا کە بوون بە جوولەکە (یەهودی) .

وه پێغەمبەران مرۆڤن و دروستکراون ، هیچ تایبەتمەندێتی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتیان نییه ، خوای گەورە سەبارەت بە پێغەمبەرەکەی (مُحمَّـد ﷺ) کە سەروەری پێغەمبەرانە و لە هەموویان حورمەتی گەورەترە لای خوا فەرموویەتی : ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨﴾ [الأعراف] .

واته : ئەی پێغەمبەر بڵێ : من هیچ سود و زیانم بە دەست نییە بۆ خۆم تەنها ئەوە نەبێت کە خوا ویستی لێبێت ، وە ئەگەر من پەنهانیم (غەیبم) بزانیایەت ئەوا خێرێکی زۆرم دەستی خۆم دەخست و هیچ خراپەیەکم تووش نەدەبوو ، من هیچ نیم تەنها ئاگادارکەرەوە و مژدەدەر نەبێت بۆ خەڵکانێك کە باوەڕبێنن .

وه خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا ٢١ قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٞ وَلَنۡ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدًا ٢٢﴾ [الجن] .

واته : ئەی پێغەمبەر بڵێ : من هیچ زیان و رێنماییم بە دەست نییە بۆ ئێوە ٢١ بڵێ : من کەس نییە پەنام بدات لە خوا ئەگەر بیەوێت سزام بدات و کەسیش نییە جگە لە ئەو پشت و پەنام بێت .

وه پێغەمبەران تایبەتمەندێتی مرۆڤایەتیان پێدەگات : لە نەخۆشی و مردن و پێویست بوون بە خواردن و خواردنەوە و جگە لەمانەش ، خوای

گەورە سەبارەت بە پێغەمبەر (إبراهیم علیه الصلاة والسلام) لە وەسف کردنیدا بۆ پەروەردگاری فەرموویەتی : ﴿وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾﴾ [الشعراء] .

واتە : پەروەردگاری من ئەوەیە کە خواردن و خواردنەوەم دەداتێ ﴿٧٩﴾ وە ئەگەر نەخۆش بکەوم ئەو شیفام دەدات و چاکم دەکاتەوە ﴿٨٠﴾ وە ئەوەیە کە دەمرێنێ و پاشان زیندووم دەکاتەوە .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ ، فَإِذَا نَسِيتُ فَذَكِّرُونِي»[١٢] .

واتە : بەڕاستی منیش مرۆڤێکم وەکو ئێوە شتم لە بیر دەچێتەوە هەروەکو چۆن ئێوەش شتان لە بیر دەچێتەوە ، بۆیە ئەگەر لە بیرم چووەوە ئەوا ئێوە بیرمی خەنەوە .

وە خوای گەورە وەسفی پێغەمبەرانی کردووە بە بەندایەتی (عەبدایەتی) کردن بۆی لە بەرزترین جێگەیاندا ، ئەوەتا سەبارەت بە (نوح ﷺ) فەرموویەتی : ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾﴾ [الإسراء] .

واتە : بەڕاستی نوح بەندەیەکی شوکرانەبژێر بوو .

وە سەبارەت بە (مُحمَّد ﷺ) فەرموویەتی : ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾﴾ [الفرقان] .

واتە : پڕ خێر و بە پیت بێت کاری ئەو خوایەی کە قورئانی (جیاکەرەوەی نێوان حەق و باتڵ) دابەزاندووەتە سەر بەندەکەی بۆ

---

[١٢] رواه البخاري ، كتاب أبواب القبلة ، باب التوجه إلى القبلة حيث كان ، رقم : (٣٩٢) .

ئەوەی ببێت بە ئاگادارکەرەوە بۆ هەموو خەڵکی جیهان .

وە سەبارەت بە (إبراهيم وإسحاق ويعقوب صلى الله عليهم وسلّم) فەرموویەتی :

﴿وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ أُولِي الْأَيْدِي وَالْأَبْصَارِ ﴿٤٥﴾ إِنَّا أَخْلَصْنَاهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى الدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ الْمُصْطَفَيْنَ الْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾﴾ [سورة ص] .

واتە : باسی بەندەکانمان (إبراهيم وإسحاق ويعقوب) بکە کە خاوەنی کردەوەی چاك و زانستی بە سوود بوون ﴿٤٥﴾ بەڕاستی ئێمە پاڵفتەیانمان کردبوون بە خۆیەکلاکردنەوە بۆ بیرکردنەوە لە بەهەشت و کردەوە و بانگەواز کردن بۆی (یان بەڕاستی ئێمە بەهەشتمان تایبەت کردبوو بۆیان لە بەرامبەر بیرلێکردنەوە و باس کردنیان بۆی) ﴿٤٦﴾ وە بەڕاستی ئەمانە لای ئێمە لە هەڵبژێردراو و چاکەکانن .

وە سەبارەت بە (عیسی بن مَـریَم ﷺ) فەرموویەتی : ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾﴾ [الزخرف] .

واتە : (عیسی) هیچ نییە تەنها بەندەیەك نەبێت کە نیعمەتی خۆمانمان داوە بەسەریدا بە پێغەمبەرایەتی و زانست و دانایەتی و کردووەمانە بە نیشانە و بەڵگەیەك بۆ بەنی ئیسرائیل (واتە : نەوەکانی پێغەمبەر یعقوب) .

*** وە باوەڕبوون بە پێغەمبەران چوار بوار دەگرێتەوە :**

**یەکەم** : باوەڕبوون بەوەی کە پەیامەکانیان حەق و ڕاستن و لە لایەن خوای گەورە هاتوون ، جا هەر کەسێك بێباوەڕ ببێت بە پەیامی یەکێکیان ئەوە بێباوەڕ بووە بە هەر هەموویان ، وەکو چۆن خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾﴾ [الشعراء] .

واتە : گەلەکەی (نوح) پێغەمبەرانیان بە درۆ خستەوە .

خوای گەورە کردوویانێتی بە بەدرۆخەرەوە بۆ هەموو پێغەمبەران ، لە کاتێکدا کە لەو سەردەمەدا کە ئەوان بەدرۆیان خستەوە هیچ پێغەمبەرێکی تر نەبووە جگە لە (نوح) ، کەواتە بە پێی ئەمە ئەو گاورانەی کە پێغەمبەر (مُحمَّـــد)یان (ﷺ) بە درۆ خستەوە و شوێنی نەکەوتن ئەوانە بەدرۆخەرەوەشن بۆ (مسیح بن مَرْیَم ﷺ) و بەهەمان شێوە شوێنی ئەویش نەکەوتوون ، بە تایبەتی کە مژدەی پێداون بە هاتنی (مُحمَّـد ﷺ) ، وە مژدە پێدانیان بە (مُحمَّد ﷺ) هیچ مانایەکی نییە تەنها ئەوە نەبێت کە بەڕاستی پێغەمبەرە بۆیان ، خوا بە هۆیەوە ڕزگاریان دەکات لە گومڕایەتی و ڕێنماییان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست .

**دووەم** : باوەڕبوون بەوانەیان کە ناویان دەزانین بە ناوەکانیانەوە وەکو (مُحمَّد وإبراهیم وموسى وعیسى ونوح علیهم الصلاة والسلام) ، وە ئەم پێنجە بریتین لە خاوەنەکانی توانا و خۆڕاگرتن (أولوا العزم) لە پێغەمبەران ، کە خوای گەورە لە قورئانــدا لە دوو شوێندا باسی کردوون لە فەرمایشتی :

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۝٧﴾ [الأحزاب] .

واتە : ئەی (مُحمَّد) ئێمە بەڵێنمان وەرگرتووە لە پێغەمبەران و لە تۆ و لە (إبراهیم وموسى وعیسى بن مــریَم)یش کەوا هەستن بە جێبەجێکردن و گەیاندنی ئاینی خوا .

وە لە فەرمایشتی : ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۝١٣﴾ [الشورى] .

واته خوای پەروەردگار : بۆتانی داناوە لە ئایندا ئەوەی کە ئامۆژگاری (نوح)ی پێکردووە و ئەوەش کە بە وەحیی ناردوومانە بۆ تۆ و ئەوەش کە ئامۆژگاری (إبراهيم وموسى وعيسى)مان پێکردووە : کەوا ئاین بە ڕێك و ڕاستی جێبەجێ بکەن و پەرتەوازە نەبن تێیدا * .

بەڵام ئەوانەشیان کە ناوەکانیان نازانین لێیان باوەڕمان پێیان هەیە بە گشتی ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ ﴿٧٨﴾﴾ [غافر] .

واتە : وە بەدڵنیایی ئێمە چەندین پێغەمبەرمان ناردووە لە پێش تۆ بەسەرهاتی هەندێکیانمان باس کردووە بۆت و بەسەرهاتی هەندێکیانمانیش نەگێڕاوەتەوە بۆت .

**سێیەم** : بەڕاست دانانی ئەوەی کە ڕاستە (صەحیحە) لە بەسەرهات و هەواڵەکانیان .

**چوارەم** : کردەوە کردن بە شەریعەتی ئەوەیان کە نێردراوە بۆ ئێمە ئەویش کۆتایی پێهێنەریانە (مُحمَّد ﷺ) کە نێردراوە بۆ هەموو خەڵکی ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ [النساء] .

واتە : سوێند بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر ئەو خەڵکە باوەڕ ناهێنن

---

* ئەم ئایەتە ڕوون ترین بەڵگەیە لەسەر **حەرامێتی حزبایەتی** کە موسڵمانانی پەرتەوازە و پارچەپارچە کردووە ، بڕوانە کتێبی : (فەتوای گەورە زانایانی هاوچەرخی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە حوکمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچەپارچەگەریی) ئامادەکردن و وەرگێڕانی وەرگێڕ : (محمد عبد الرحمن).

و بێباوەڕن تاوەكو تۆ نەكەن بە دادوەر لەو شتانەدا كە ناكۆكی دەكەوێتە نێوانیانەوە تێیدا و ئەنجا لە ناخیانەوە دڵگران نەبن بەو بڕیارەی تۆ و ملكەچ ببن بە تەواوی .

وە **باوەڕبوون بە پێغەمبەران** چەندین بەرهەمی گەورەی هەیە ، لەوانە :

**یەكەم** : زانینی بەزەیی خوای گەورە و بایەخدانی بە بەندەكانی ، كەوا پێغەمبەرانی بۆ ناردوون ، بۆ ئەوەی ڕێنماییان بكەن بۆ ڕێگای خوای گەورە ، و ڕوونی كەنەوە بۆیان كە چۆن خوا بپەرستن ، چونكە عەقڵی مرۆڤ سەربەخۆ ئەوە نازانێت .

**دووەم** : سوپاس كردنی خوای پایەبەرز لەسەر ئەم نیعمەتە گەورەیە .

**سێیەم** : خۆشویستنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و بەگەورەزانینیان و ستایش كردنیان بەوەی كە شایەنە پێیان ، چونكە ئەوانە پێغەمبەرانی خوای گەورەن ، وە لەبەر ئەوەی كە هەستاوون بە پەرستنی خوا و گەیاندنی پەیامەكەی و ئامۆژگاری كردنی بەندەكانی .

*** وە یاخی بووان لە حەق و پێچەوانەكەرانی ڕاستی پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆخستووەتەوە** بە بۆچوونی ئەوەی كەوا پێغەمبەرانی خوای گەورە نابێت لە مرۆڤ بن !

وە خوای گەورە ئەم بۆچوونەی باس كردووە و پوچەڵیشی كردووەتەوە بەم فەرمایشتەی : ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾ [الإسراء] .

واتە : هیچ شتێك ڕێگری لە خەڵك نەكرد لەوەی كە باوەڕ بێنن لە

کاتێکدا کە ڕووناکی و ڕێنماییان بۆ هات تەنها ئەوە نەبێت کە دەیانگووت : ئایا خوا مرۆڤی ناردووە بە پێغەمبەر ؟ ﴿٩٤﴾ تۆش بڵێ : ئەگەر لە زەویدا فریشتە هەبوایەت و بە ئارامی ڕێیان بکردایەت ئەوا ئێمەش لە ئاسمانەوە فریشتەمان بە پێغەمبەرایەتی دادەبەزاند بۆ سەریان .

خوای گەورە ئەم بۆچوونەی پوچەڵ کردەوە بەوەی کەوا پێویستە پێغەمبەر مرۆڤ بێت ، چونکە ئەو نێردراوە بۆ لای خەڵکی سەر زەوی کە بریتین لە مرۆڤ ، وە ئەگەر خەڵکی سەر زەوی فریشتە ببوایەن ئەوا خوا لە ئاسمانەوە فریشتەی بۆ دادەبەزاندن بە پێغەمبەرایەتی بۆ ئەوەی ئەویش وەکو ئەوان بێت .

وە خوای گەورە لە بەدرۆخەرەوانی پێغەمبەرانی گێڕاوەتەوە کەوا بە پێغەمبەرانیان وتویانە : ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ﴿١١﴾﴾ [إبراهيم] .

واتە : ئێوە هیچ نین تەنها مرۆڤ نەبێت وەکو ئێمە دەتانەوێت ڕێگریمان لێبکەن لەوەی کە باوباپیرانمان دەیانپەرستن بۆیە بەڵگەی روونمان (موعجیزەیەکمان) بۆ بێنن ﴿١٠﴾ پێغەمبەرانیان پێیانیان فەرموو : ڕاستە ئێمە هیچ نین تەنها مرۆڤ نەبێت وەکو ئێوە ، بەڵام خوا چاکەی خۆی ـ لە پێغەمبەرایەتی ـ دەدات بە هەر کەسێك ویستی لێبێت لە بەندەکانی ، وە ئێمە بۆمان نییە بەڵگەی ڕوونتان (موعجیزەتان) بۆ بێنین ئیللا بە مۆڵەتی (ئیزنی) خوا نەبێت .

# باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی

ڕۆژی دوایی : ڕۆژی هەستانەوەیە کەوا خەڵکی تێیدا زیندوو دەبنەوە بۆ لێپرسینەوە و پاداشت وەرگرتنەوە .

وە ناو نراوە بە (ڕۆژی دوایی / الیوم الآخر) چونکە هیچ ڕۆژی تری بە دواوە نییە ، لەبەر ئەوەی خەڵکی بەهەشت جێگیر دەبن لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیان ، وە خەڵکی دۆزەخیش جێگیر دەبن لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیان .

*** وە باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی سێ بوار دەگرێتەوە :**

**یەکەم** : باوەڕبوون بە زیندوو بوونەوە (الإیمان بالبعث) : کە بریتییە لە زیندوو کردنەوەی مردووەکان کاتێك کە فوو دەکرێت بە کەڕەنادا فوو کردنی دووەم ، یەکسەر خەڵکی هەڵدەسنەوە بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان بە پێی پەتی بە بێ پێڵاو ، وە بە رووتی بە بێ پۆشتەیی ، وە بەو پێستەوە کە لە کاتی خەتەنەکردندا دەبڕێت بە بێ خەتەنەکراوی ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ وَعْدًا عَلَيْنَآ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ ۝١٠٤﴾ [الأنبياء] .

واتە : هەر وەکو چۆن سەرەتا و یەکەم جار دروستمان کردن ئاوەهایش دەیانگێڕینەوە ، بەڵێنێکە بەسەرمانەوە بەڕاستی ئێمە جێبەجێی دەکەین .

وە زیندوو بوونەوە : ڕاستە و سەلمێنراوە ، قورئان و سوننەت و کۆڕا و یەکدەنگی موسڵمانان بەڵگەن لەسەری .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ۝١٥ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ ۝١٦﴾ [المؤمنون] .

واتە : ئەنجا ئێوە دوای ئەوە بە دڵنیایی دەمردن ﴿١٥﴾ پاشان ئێوە لە ڕۆژی هەستانەوەدا زیندوو دەکرێنەوە .

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً))[١٣] .

واتە : لە ڕۆژی قیامەتدا (هەستانەوە لە گۆڕ بۆ ساحەی مەحشەر) خەڵکی کۆدەکرێنەوە بە پێی پەتی و بە ڕووتی و بە خەتەنە نەکراوی .

وە هەموو موسڵمانان کۆڕا و یەکدەنگن لەسەر سەلماندنی ڕۆژی دوایی ، وە ئەوەیش داخوازیکاری دانایەتییە ، چونکە دانایەتی ئەوە دەخوازێت کەوا خوای گەورە گێڕانەوەیەك دابنێت بۆ ئەم بوونەوەرە ، بۆ ئەوەی تێیدا پاداشتیان بداتەوە لەسەر ئەوەی کە بۆی داناون لەو شەریعەتانەدا کە پێغەمبەرانی خۆیی پێناردووە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ [المؤمنون] .

واتە : ئایا ئێوە واتان داناوە کەوا ئێمە دروستمان کردوون بە گاڵتە و بێمەبەست و ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لامان ؟

وە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەیی (ﷺ) فەرموویەتی : ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴿٨٥﴾﴾ [القصص] .

واتە : بەڕاستی ئەو خوایەی کە قورئانی دابەزاندووە بۆت و پێویستی کردووە لەسەرت بیگەیەنیت دەتگێڕێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی .

---

[١٣] رواه البخاري ومسلم ، واللفظ لمسلم ، كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها ، باب فناء الدنيا ، رقم : (٧١٢٧) .

**دووەم** : باوەڕبوون بە لێپرسینەوە و پاداشت وەرگرتنەوە (الإیمان بالحساب والجزاء) : بەندە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت لەسەر کردەوەکانی و پاداشتی دەدرێتەوە لەسەری ، وە قورئان و سوننەت و کۆڕا و یەکدەنگی (إجماع) موسڵمانان بەڵگەن لەسەر ئەمە .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾﴾ [الغاشیة] .

واتە : بەڕاستی گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمە ﴿٢٥﴾ پاشان بەڕاستی لێپرسینەوەشیان لەسەر ئێمەیە .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ [الأنعام] .

واتە : هەر کەسێك چاکەیەك بێنێت ئەوە (١٠) دە ئەوەندە پاداشتی بۆ هەیە ، وە هەر کەسێك خراپەیەك بێنێت ئەوە پاداشت نادرێتەوە ئیللا وەکو خۆی نەبێت و ستەمیشیان لێناکرێت .

وە فەرموویەتی : ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [الأنبیاء] .

واتە : ئێمە تەرازووەکانی دادپەروەری دادەنەین بۆ ڕۆژی هەستانەوە (قیامەت) جا هیچ ستەم ناکرێت لە هیچ کەسێك ، وە ئەگەر بە ئەندازەی کێشی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت دەیهێنین بۆ ئەوەی پاداشتی خاوەنەکەی پێ بدرێتەوە ، وە بەسە کەوا ئێمە کردەوەی بەندەکان بژمێرین و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەین .

وە لە (ابن عمر)ەوە (رضي الله عنهما) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّ اللَّهَ

يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ ــ أي سِتْرَهُ ــ وَيَسْتُرُهُ ، فَيَقُولُ : أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا ؟ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا ؟ فَيَقُولُ : نَعَمْ أَيْ رَبِّ ، حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ ، قَالَ : سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا ، وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ ، فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ ، وَأَمَّا الْكُفَّارُ وَالْمُنَافِقُونَ فَيُنَادَى بِهِمْ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ : هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ ، أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ»[١٤] .

**واتە : بەڕاستی خوا باوەڕدار نزیک دەکاتەوە ئەنجا بە پاراستنی دەگرێتەوە و دەیپۆشێت ، ئەنجا پێی دەفەرموێت : ئایا فلآنە تاوان دەزانیت ؟ ئایا فیسارە تاوان دەزانیت ؟ ئەویش دەڵێت : بەڵێ ئەی پەروەردگار ، هەتاوەکو دانی پێدەنێت بە تاوانەکانیدا و وا دەبینێت کەوا تیاچووە ، خوا دەفەرموێت : من لە دونیادا تاوانەکانتم پۆشی لەسەرت ، وە من ئەمڕۆ لێیان خۆشدەبم لێت ، ئەنجا کتێبی چاکەکانی پێ دەدرێت .**

**بەڵام بێباوەڕ و دووڕووەکان ئەوا بانگ دەکرێن لە پێش چاوی هەموو بوونەوەردا و پێیان دەوترێت : ئەمانە ئەوانەن کەوا درۆیان کرد لەسەر خوا ، لەعنەتی خوا لەسەر ستەمکاران بێت .**

**وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :** «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ، ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ : فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً ، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ ، وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً ، وَإِنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً»[١٥] .

---

[١٤] رواه البخاري ، كتاب المظالم ، باب قول الله تعالى : (أَلاَ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ) ، رقم : (٢٣٠٩) .

[١٥] رواه البخاري ، كتاب الرقاق ، باب من همَّ بحسنة أو سيئة ، رقم : (٦١٢٦) ، ورواه مسلم ، كتاب الإيمان ، باب إذا همَّ العبد بحسنة كتبت و إذا همَّ بسيئة لم تكتب رقم : (٣٣٥) .

واتە : بەڕاستی خوا چاکەکان و خراپەکانی نووسیوە ، ئەنجا ڕوونیشی کردووەتەوە : جا هەر کەسێك نیازی کردنی چاکەیەك هات بە دڵیدا و نەیکرد ئەوا خوا لای خۆی یەك چاکەی تەواوی بۆ دەنووسێت ، وە ئەگەر نیازی کردنی چاکەیەك هات بە دڵیدا و کردی ئەوا خوا لای خۆی بۆی دەنووسێت بە (١٠) چاکە تا (٧٠٠) حەوسەد ئەوەندە تا ئەوەندەی زۆر تریش ، وە هەر کەسێك نیازی کردنی خراپەیەك هات بە دڵیدا و نەیکرد ئەوا خوا لای خۆی یەك چاکەی تەواوی بۆ دەنووسێت ، وە ئەگەر نیازی کردنی خراپەیەك هات بە دڵیدا و کردی ئەوا خوا یەك خراپەی بۆ دەنووسێت .

وە هەموو موسڵمانان کۆڕا و یەکدەنگن لەسەر سەلماندنی لێپرسینەوە و پاداشت وەرگرتنەوە لەسەر کردەوەکان ، وە ئەوەیش داخوازیکاری دانایەتییە ، چونکە خوای گەورە کتێبەکانی دابەزاندووە و پێغەمبەرانی ناردووە و پێویستیشی کردووە لەسەر بەندەکان کەوا ئەوە وەربگرن کە پێی هاتوون و کردەوەش بکەن بەوەی کە پێویستە کردەوەی پێبکرێت لێی ، وە خوا پێویستی کردووە کوشتار بکرێت لەگەڵ ئەوانەدا کە بەرهەڵستی لێ دەکەن و خوێنیان و منداڵیان و ئافرەتانیان و سامانیانی حەڵاڵ کردووە ، جا ئەگەر لێپرسینەوە و پاداشت وەرگرتنەوە نەبوو بوایەت ئەوا ئەمانە بەشێك دەبوون لە کاری بێ سوود و بێ ئەنجام کە پەروەردگاری دانای لێ بە دوور و پاك ڕادەگیرێت ، وە خوای گەورە ئاماژەی کردووە بۆ ئەمە بە فەرمایشتی :

﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝٦ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ۝٧ ﴾ [الأعراف] .

واته : به دڵنیایی پرسیار دەكەین لەوانەی پێغەمبەریان بۆ نێردراوە سەبارەت بە وەڵامدانەوەیان بۆیان و پرسیاریش دەكەین لە پێغەمبەران سەبارەت بەوەی كە گەیاندوویانە ۞ بە دڵنیایی بە زانستەوە بۆیان دەگێڕینەوە كە چیان كردووە ، وە ئێمە نادیار و بێ ئاگا نەبووین لێیان .

**بواری سێیەم** : باوەڕبوون بە بەهەشت و ئاگری دۆزەخ و بەوەش كەوا هەردووكیان دەرئەنجامی هەتاهەتایین بۆ دروستكراوەكان .

**بەهەشت**ماڵی خۆشگوزرانی‌یە كە خوای گەورە ئامادەی كردووە بۆ باوەڕدارە خۆپارێز و لە خوا ترسەكان ، ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوە بەوەی كە خوا پێویستی كردووە لەسەریان باوەڕی پێبهێنرێت و هەستاون بە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەكەی ، بە پاكی پەرستنیان كردووە بۆ خوا و شوێنی پێغەمبەرەكەی كەوتوون .

بەهەشت لە جۆرەها خۆشگوزرانی تێدایە ئەوەی كە : «مَا لاَ عَيْنَ رَأَتْ ، وَلاَ أُذُنَ سَمِعَتْ ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ»[١٦] .

واتە : نە چاو بینیویەتی ، و نە گوێ بیستویەتی ، و نە بە خەیاڵیش هاتووە بەسەر دڵی مرۆڤدا .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ۝٧ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ۝٨﴾ [البينة] .

واتە : بەڕاستی ئەوانەی كەوا باوەڕیان هێناوە و كردەوەی چاكەیان كردووە ئا ئەوانە باشترینی دروستكراوەكانن ۞ پاداشتیان لای

[١٦] رواه البخاري ، كتاب بدء الخلق ، باب ما جاء في وصف الجنة وأنها مخلوقة ، رقم : (٣٠٧٢) .

پەروەردگاریان باخانێکی هەتاهەتاییە کە ڕوباریان بە ژێردا تێدەپەڕێت و بە هەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە ، ، ئەوانە خوا لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون ، ئەو پاداشتە بۆ ئەوانەیە کە لە پەروەردگاریان دەترسن .

وە فەرموویـــــەتی : ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ [السجدة] .

واتە : هیچ کەسێك نازانێت چی هەڵگیراوە بۆ بەهەشتیەکان لەوەی کە چاو ئۆقرەی پێدەگرێت لە پاداشتی ئەو کردەوانەی کە دەیانکردن .

بەڵام **ئاگری دۆزەخ** : بریتییە لە ماڵی سزا کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ بێباوەڕە ستەمکارەکان ، ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بە خوا و سەرپێچی پێغەمبەرەکانیان کردووە .

دۆزەخ لە جۆرەها سزا و تۆڵەی تێدایە ئەوەی کە نەهاتووە بەسەر هیچ بیرو دڵێکدا ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾ [آل عمران] .

واتە : خۆپارێزی بکەن لەو ئاگرەی کە ئامادە کراوە بۆ بێباوەڕەکان .

وە فەرموویەتی : ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾ [الكهف] .

واتە : ئەی پێغەمبەر بڵێ بە خەڵکی : ئەمەی کە پێتانی ڕادەگەیەنم ڕاستە و لای پەروەردگارتانەوە هێناومە ، جا هەر کەسێك دەیەوێت باوەڕ بێنێت با باوەڕ بێنێت وە هەر کەسێکیش دەیەوێت باوەڕ نەهێنێت با باوەڕ

نەهێنێت ، بەڕاستی ئێمە ئاگرێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران کەوا چواردەوری داون بە پەرژینەکانی و ناتوانن لێی دەرباز ببن ، وە ئەگەر داوای ئاویش بکەن ئەوا ئاوێکیان پێدەدرێت وەکو قورقوشمی تواوە وایە کەوا ڕوومەتەکان دەبرژێنێت ، ئەمە خراپترین خواردنەوەیە و دۆزەخیش خراپترین جێ و شوێنە بۆ هاوڕێیەتی .

وە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ ﴾ [الأحزاب] .

واتە : بەڕاستی خوا نەفرەتی کردووە لە بێباوەڕەکان و دۆزەخی گڕتێبەردراوی بۆ ئامادە کردوون ﴿٦٤﴾ بە هەتاهەتایی تێیدا دەمێننەوە و هیچ دۆست و پشتیوانێکیشیان نییە تکایەکیان بۆ بکات ﴿٦٥﴾ ڕۆژێکە کەوا ڕوومەتیان هەڵدەگەڕێتەوە لە نێو ئاگردا و دەڵێن : خۆزگایە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان بکردایەت .

* وە **باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی** چەندین بەرهەمی گەورەی هەیە ، لەوانە :

**یەکەم** : حەزکردن لە ئەنجامدانی چاکە و سووربوون لەسەری بە ئومێدی پاداشتی ئەو ڕۆژە .

**دووەم** : ترسان لە ئەنجامدانی خراپە و ڕازی بوون پێی لە ترسی سزای ئەو ڕۆژە .

**سێیەم** : دڵنەوایی کردنی باوەڕدار سەبارەت بەوەی کە لە دەستی دەردەچێت لە دونیادا بەوەی کە ئومێدی پێی هەیە لە خۆشگوزرانی دواڕۆژ و پاداشتەکانی .

* **وە بێباوەڕەکان نکۆڵی** (ئینکاری) **زیندوو بوونەوەی دوای مردنیان کردووە** ، بۆچوونیان وایە کەوا ئەمە مەحاڵە .

ئـەم بۆچـوونەش پوچـەڵە ، شـەرع و هەسـت و عـەقڵ بەڵگـەن لەسـەر پوچەڵیەتییەکەی .

**بەڵگەی شەرع** : خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبْعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ۝٧﴾ [التغابن] .

واتە : بێباوەڕەکان بۆچوونیان وایە کەوا زیندوو ناکرێنەوە ، تۆش بڵـێ : بەڵـێ سوێند بە پەروەردگارم بەدڵنیایی زیندوو دەکرێـــنەوە ئەنجا هـەواڵی کردەوەکانیشتان پێ دەدرێت ، وە ئەوەش لای خوا ئاسانە .

وە هـەموو کتێبـە ئاسمانییـەکان پێکهـاتوون لەسـەر هـەبوونی زینـدوو بوونەوە لە دوای مردن .

وە **بەڵگـەی هەست** : ئەوەیـە کـە خـوا لـەم دونیایـەدا زینـدوو کردنـەوەی مردووی پێشانی بەندەکانی داوە ، وە لە سورەتی (البقـــرة)دا پێـنج نموونـە هەیە لەسەر ئەمە ، کە بریتین لەمانە :

**نموونەی یەکەم** : گەلی پێغەمبەر (موسی) کاتێك کە پێیان وت : ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ ۝٥٥﴾ [البقرة] .

واتە : ئێمە باوەڕت پێناهێنین تاوەکو بە ئاشکرا خوا نەبینین .

دوای ئـەوە خـوای گـەورە مرانـدیانی پاشـان زینـدوویی کردنـەوە ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە بە (نـەوەکانی ئیسرائیل) دەفـەرموێت : ﴿وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ۝٥٥ ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ۝٥٦﴾ [البقرة] .

واتە : وە ئێوە وتتان ئەی (موسی) ئێمە باوەڕت پێناهێنین تاوەکو بە ئاشکرا خوا نەبینین ، بۆیە هەورەتریشقە لەناوتانی برد و ئێوەیش سەیرتان دەکرد ﴿٥٥﴾ ئەنجا دوای مردنتان زیندووتانمان کردووە بۆ ئەوەی سوپاس و شوکری خوا بکەن .

**نمونەی دووەم** : لە چیرۆکی ئەو کوژراوەی کەوا (نەوەکانی ئیسرائیل) ناکۆکی کەوتە بەینیانەوە تێیدا ، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێکردن کەوا مانگایەك سەربڕن و ئەنجا بە هەندێکی بدەن لێی ، بۆ ئەوەی هەواڵیان بداتێ بەو کەسەی کە کوشتویەتی ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾﴾ [البقرة] .

واتە : وە ئێوە کەسێکتان کوشت و کەوتنە گومانەوە تێیدا ، وە خوا ئەوە دەردێنێت کەوا ئێوە دەیشارنەوە ﴿٧٢﴾ بۆیە فەرموومان : بە هەندێکی بدەن لێی ، ئا بەو شێوەیە خوا مردوو زیندوو دەکاتەوە و نیشانەکانی توانای خۆیتان پیشان دەدات بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە و ژیر بن .

**نمونەی سێیەم** : لە چیرۆکی ئەو خەڵکانەی کەوا بە هەزاران کەس لە وڵاتی خۆیان دەرچوون بە مەبەستی ڕا کردن لە مردن ، کە چی خوای گەورە مراندیانی ، پاشان زیندووی کردنەوە ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ

ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ ﴾ [البقرة] .

واتــە : ئایـا ناڕوانیـت بـۆ ئەوانـەی کـە بـە هـەزاران لـە ولاتـی خۆیـان دەرچوون لـە ترسـی مردنـدا و خـوا پێیـانی فـەرموو : بمـرن ئـەنجا زینـدووی کردنـەوە ، بەڕاسـتی خـوا چـاکەی زۆرە بەسـەر خەڵکـەوە بـەڵام زۆربـەی خەڵکی سوپاس و شوکری ناکەن .

**نموونـەی چـوارەم** : لـە چـیرۆکی ئـەو کەسـەی کـە تێپـەڕ بـوو بـە لای گونـدێکی چـۆڵ و وێرانـی مـردوودا و بـە دووری دانـا کـەوا خـوای گـەورە زیندووی بکاتەوە ، بۆیە خوای گەورە ئەو کەسەی (١٠٠) سـەد سـاڵ مرانـد و پاشان زیندووی کردەوە ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە دەفـەرموێت : ﴿ أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ ۖ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا ۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾ ﴾ [البقرة] .

واتە : یان وەکو ئەوەی کە تێپەڕ بوو بە لای گوندێکدا کە چۆڵ و وێران بوو بوو بەسەر یەکدا و وتـی : چـۆن خـوا ئـەمـە زینـدوو دەکاتـەوە لـە دوای مردنی ؟ بۆیە خوا (١٠٠) سەد ساڵ مراند و پاشان زیندووی کـردەوە ، پـێی فەرموو : چەندێك مایتەوە ؟ وتی : ڕۆژێك یان هەندێ لە ڕۆژێك ماومەتـەوە ، فـەرمووی : بـەڵکو (١٠٠) سـەد سـاڵ ماویتەتـەوە بڕوانـە بـۆ خـواردن و خواردنەوەکـەت هـیچ گـۆڕانێکی بەسـەردا نـەهاتووە ، وە بڕوانـە بـۆ

گوێدرێژەکەت ببینە چۆن خوا زیندووی دەکاتەوە ، بۆ ئەوەی تۆ بکەین بە نیشانە و بەڵگەیەك لەسەر زیندووبوونەوە ، وە بڕوانە بۆ ئێسقانەکان چۆن بەرزیان دەکەینەوە و یەکیان دەخەین و ئەنجا گوشتی بە بەردا دەکەین ، جا کاتێك ئەمەی بۆ روون بووەوە و توانای خوای بۆ دەرکەوت وتی : دەزانم بەڕاستی خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

**نموونەی پێنجەم** : لە چیرۆکی پێغەمبەر (إبـراهيم الـخليل)دا ، لە کاتێکدا کە داوا دەکات لە خوای گەورە کەوا پێشانی بدات چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە ، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێدەکات بە سەربڕینی چوار باڵندە و ئەنجا بەش بەشیان بکاتەوە و پەرتەوازەیان بکات بەسەر شاخەکانی دەوروبەریدا ، پاشان بانگیان بکات ، ئەنجا هەموو بەشەکان یەکدەگرنەوە و بە پەلە دێن بۆ لای (إبـراهيم) ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾﴾ [البقرة] .

واتە : وە (إبراهيم) وتی : پەروەردگارم پێشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە ، فەرمووی : باشە ئایا تۆ باوەڕت نەهێناوە؟ وتی : بەڵێ بەلام بۆ ئەوەی دڵم ئارام بگرێت ، فەرمووی : چوار باڵندە ببە سەریانببڕە و پارچە پارچەیان بکە و ئەنجا لەسەر هەر شاخێك بەشێکیانی لێ دابنێ پاشان بانگیان بکە بە پەلە دێن بۆ لات ، وە بزانە کەوا بەڕاستی خوا بەدەسەلات و دانایە .

ئەمانە چەند نموونەیەکی هەستپێکراو بوون کە ڕوویان دابوو لە واقعدا ، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە زیندوو کردنەوەی مردووان شتێکە دەشێت ڕووبدات و مەحاڵ نییە .

وە لە پێشەوە ئاماژە کرا بۆ ئەوەی کە خوای گەورە کردبووی بە بەشێك لە نیشانەکانی (موعجیزەکانی) پێغەمبەر (عیسی بن مریَم) لە زیندوو کردنەوەی مردووان و دەرهێنانیان لە گۆڕەکانیان بە مۆڵەتی (ئیزنی) خوای گەورە .

بەڵام **بەڵگەی عەقڵ** لەسەر هەبوونی زیندوو بوونەوە لە دوای مردن : ئەوا لە دوو ڕووەوەیە :

**یەکەمینیان** : بەڕاستی خوای گەورە دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشی کە لە نێوانیاندایە ، دروستکاریانە لە سەرەتاوە ، وە بە توانایە بەسەر سەرەتای دروست کردنی دروستکراودا ، بێدەسەڵات نییە بەسەر گێڕانەوەی ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ﴿٢٧﴾﴾ [الروم] .

واتە : خوا ئەوەیە کە سەرەتا دروستکراوی دروست کردووە پاشان لە دوای مردنی دەیگێڕێتەوە ، ئەوەیش (واتە : گێڕانەوە لە سەرەتای دروست کردن) ئاسان ترە لەسەری .

وە فەرموویەتی : ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَـٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ [الأنبياء] .

واتە : هەر وەکو چۆن سەرەتا و یەکەم جار دروستمان کردن ئاوەهایش دەیانگێڕینەوە ، بەڵێنێکە بەسەرمانەوە بەڕاستی ئێمە جێبەجێی دەکەین .

وه خوای گەورە فەرمانی کردووە بە وەڵامدانەوەی ئەو کەسەی کەوا نکوڵی کرد لە زیندوو کردنەوەی ئێسقانی ڕزاو و فەرموویەتی : ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾﴾ [يس] .

واتە : بەڵێ ئەو کەسە زیندووی دەکاتەوە کەوا یەکەم جار دروستی کردووە ، وە ئەویش زانایە بە هەموو شتێك .

**دووەمیان** : بەڕاستی زەوی مردوو و خامۆش و وشکە ، هیچ درەختی سەوزی تێدا نییە ، ئەنجا باران دەبارێت بەسەریدا و لە دوای ئەوە دەجووڵێت بەو ڕووەکانەی ناوی و سەوز و زیندوو دەبێتەوە ، لە هەموو جۆرە ڕووەك و درەختێکی گەشاوە و سەرنجڕاکێشی تێدا دەبێت ، جا ئەو کەسەی کە بە توانایە بەسەر زیندوو کردنەوەی زەویدا لە دوای مردنی (خامۆش و وشك بوونی) ، بە توانایشە بەسەر زیندوو کردنەوەی مردوواندا ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۚ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾ [فصلت] .

واتە : لە نیشانەکانی توانا و دەسەڵاتی خوا ئەوەیە کە تۆ زەوی دەبینیت خامۆشە و هیچ ڕووەکی تێدا نییە وە ئەگەر ئاومان داباراندە سەری دەجووڵێت بەو ڕووەکانەی ناوی و سەوز دەبێتەوە و گەشە دەکات ، بەڕاستی ئەو کەسەی زەوی زیندوو کردەوە بە ڕواندنەوەی ڕووەکەکان بەدڵنیایی مردووەکانیش زیندوو دەکاتەوە ، بەڕاستی ئەو خوایە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكًا فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِزْقًا لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا كَذَلِكَ الْخُرُوجُ ﴿١١﴾ ﴾[سورة ق] .

واتە : ئێمە لە ئاسمانەوە ئاوی بە پێز و موبارەکمان دابەزاندووە ئەنجا چەندین باخ و تۆوی دروێنە کراومان پێڕوواندووە ﴿٩﴾ وە دارە خوورمای بەرزی پێڕوواندووە کە بەروبومی کۆکراوەی هەیە ﴿١٠﴾ هەموو ئەوانە ڕۆزین بۆ بەندەکان ، وە بەو ئاوە داباریوە وڵاتی مردوومان زیندوو کردووەتەوە ، بەو شێوەیەش ئێوە دەهێنینە دەرەوە لە گۆڕەکانتان .

*** وە باوەڕبوون بە هەموو ئەوانەش کە لە پاش مردنەوە ڕوودەدەن دەدرێنە پاڵ باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی** ، وەکو :

**(أ) باوەڕبوون بە تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ :** کە بریتییە لە پرسیار کردن لە مردوو دوای ناشتنی سەبارەت بە پەروەردگاری و ئاینەکەی و پێغەمبەرەکەی ، جا خوای گەورە ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە جێگیر و دامەزراو دەکات لەسەر وتەی جێگیر ، بۆیە دەڵێت : پەروەردگارم (أَللَّهُ)یە و ئیسلام ئاینمە و (مُحَمَّد ﷺ) پێغەمبەرمە ، وە خوا ستەمکاران گومڕا دەکات بۆیە بێباوەڕ دەڵێت : چی چی نازانم ، وە دووڕوو یان گومانکاریش دەڵێت : نازانم دەمبیست خەڵکی شتێکیان دەوت منیش دەموت * .

---

* بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم بابەتە : بڕوانە پاشکۆی کتێبی : (**سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان**) بە ناونیشانی : (فەرموودەکەی (البراء بن عازب ﷺ) سەبارەت بە سێ پرسیارەکەی ناو گۆڕ) لاپەڕە : (٤٣ — ٥٦) لە ئامادەکردن و وەرگێڕانی : (محمد عبد الرحمن لطيف) .

(ب) **باوەڕبوون بە سزا و خۆشی گۆڕ** : کەوا سزای گۆڕ بۆ ستەمکاران دەبێت لە دووڕووان و بێباوەڕان ، خوای گەورە فەرمووویەتی : ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾﴾ [الأنعام] .

**واتە : وە ئەگەر ببینیت لە کاتێکدا کە ستەمکارەکان لە ناڕەحەتی و ناهەمواریەکانی سەرەمەرگدان و فریشتەکان باڵەکانیان ڕاخستووە بۆ لێدانیان تاوەکو گیانیان بێتەدەرەوە و پێیان دەڵێن : گیانتان بهێننە دەرەوە ، ئەمڕۆ پاداشت دەدرێنەوە بە سزای ڕیسواکار لە بەرامبەر ئەو درۆ و ناڕاستییانەی کە لەسەر خوا دەتانوتن ، وە ئێوە خۆتان لەوە بە گەورەتر دەزانی کەوا ملکەچ و پابەند ببوایەن بۆ ئایەتەکانی خوا .**

**وە خوای گەورە سەبارەت بە (شوێنکەوتوانی فیرعەون / آل فرعون) فەرموویەتی :** ﴿ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾ [غافر] .

**واتە : خراپترین سزا کە (شوێنکەوتوانی فیرعەون) توشی دەبن بریتییە لە ئاگری دۆزەخ کە بەیانیان و ئێواران لە نێو گۆڕەکانیاندا نمایش دەکرێن بۆی و ڕۆحەکانیانی پێ سزا دەدرێت ، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا خوا دەفەرموێت : (شوێنکەوتوانی فیرعەون) بخەنە نێو توووند ترین سزاوە * .**

---

* قال ابن كثير : (هذه الآية أصل كبير في استدلال أهل السنة على عذاب البرزخ في القبور) .

**واتە : ئەم ئایەتە بنەمایەکی گەورەیە لە بەڵگەهێنانەوەی ئەهلی سوننەدا لەسەر سەلماندنی سزای بەرزەخ لە نێو گۆڕدا .**

وە لە (صحيح مسلم)دا لە فەرموودەی (زید بن ثابت)ەوە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی : «فَلَوْلاَ أَنْ لاَ تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ الَّذِي أَسْمَعُ مِنْهُ ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ : تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ ، قَالُوا : نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ النَّارِ ، فَقَالَ : تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، قَالُوا : نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ، قَالَ : تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ، قَالُوا : نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْفِتَنِ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ، قَالَ : تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ ، قَالُوا : نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ»[١٧].

واتە : ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت ئێوە مردوو نەنێژن ئەوا لە خوا دەپاڕیامەوە و داوام لێ‌ی دەکرد کەوا ئەوەی من دەبیستم لە سزای گۆڕ

---

[١٧] رواه مسلم ، كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها ، باب عرض مقعد الميت من الجنة أو النار عليه وإثبات عذاب القبر والتعوذ منه ، رقم : (٧١٤٢) .

* وە بۆ تێگەیشتنی زیاتر هۆی وتنی ئەم فەرموودەیە باس دەکەین کە لە سەرەتای فەرموودەکەدا روون کراوەتەوە :

عن زيد بن ثابت (ﷺ) قال بَيْنَمَا النَّبِيُّ (ﷺ) فِي حَائِطٍ لِبَنِي النَّجَّارِ عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ وَنَحْنُ مَعَهُ إِذْ حَادَتْ بِهِ فَكَادَتْ تُلْقِيهِ ، وَإِذَا أَقْبُرٌ سِتَّةٌ أَوْ خَمْسَةٌ أَوْ أَرْبَعَةٌ – قَالَ : كَذَا كَانَ يَقُولُ الْجُرَيْرِيُّ – فَقَالَ : مَنْ يَعْرِفُ أَصْحَابَ هَذِهِ الأَقْبُرِ ؟ فَقَالَ رَجُلٌ : أَنَا ، قَالَ : فَمَتَى مَاتَ هَؤُلاَءِ ؟ قَالَ : مَاتُوا فِي الإِشْرَاكِ ، فَقَالَ : إِنَّ هَذِهِ الأُمَّةَ تُبْتَلَى فِي قُبُورِهَا فَلَوْلاَ ...» .

واتە : لەکاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) لە نێو باخێکی دار خورمای چواردەورگیراوی (بني النّجار)دا بوو بەسەر قاترێکی خۆیەوە و ئێمەش لەگەڵیدا بووین ، لە ناکاودا قاترەکە پێغەمبەری (ﷺ) دا بە لادا و نزیك بوو لەوەی کە فڕێی بداتە خوارەوە ، لەو کاتەدا شەش یان پێنج یان چوار گۆڕی بینی ـ بەم شێوەیە (الجريري) دەیگێڕایەوە ـ ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : کێ خاوەنی ئەم گۆڕانە (واتە ئەوانەی تێیاندا نێژراون) دەناسێت ؟ پیاوێك وتی : من ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : جا ئەمانە هی چ سەردەمێکن ؟ وتی : لەسەردەمی شەریك بۆ خوا ئەنجامداندا (واتە لە پێش هاتنی ئیسلام) مردوون ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڕاستی ئەم ئوممەتە تاقیدەکرێتەوە و سزا دەدرێت لە نێو گۆڕەکانیاندا ، جا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت ...

بیدایەت بە گوێی ئێوەیشدا و بتانبیستایەت ، ئەنجا بە ڕوومەتی ڕووی تێمان کرد و فەرمووی : پەنابگرن بە خوا لە سزای ئاگر ، وتیان : پەنادەگرین بە خوا لە سزای ئاگر ، ئەنجا فەرمووی : پەنابگرن بە خوا لە سزای گۆڕ ، وتیان : پەنادەگرین بە خوا لە سزای گۆڕ ، ئەنجا فەرمووی : پەنابگرن بە خوا لە تاقیکردنەوە و ئاشووب ئەوەی کە ئاشکرایە و ئەوەشی کە نادیارە ، وتیان : پەنادەگرین بە خوا لە تاقیکردنەوە و ئاشووب ئەوەی کە ئاشکرایە و ئەوەشی کە نادیارە ، ئەنجا فەرمووی : پەنابگرن بە خوا لە تاقیکردنەوەی دەججال ، وتیان : پەنادەگرین بە خوا لە تاقیکردنەوەی دەججال .

بەلام **خۆشی گۆڕ** : ئەوا بۆ باوەڕدارە ڕاستگۆکانە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ [فصلت] .

واتە : بەڕاستی ئەوانەی کە وتویانە : پەروەردگارمان (الله)یە و ئەنجا بەردەوام بوون لەسەری تاوەکو مردن ئەوانە لە کاتی سەرەمەرگدا فریشتە دادەبەزێتە سەریان و پێیان دەڵێن : ترستان نەبێت و خەمبار و دڵگرانیش نەبن و مژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی کەوا بەڵێننتان پێدەدرا پێی .

وە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَـٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾﴾ [الواقعة] .

واتە : لە کاتی سەرەمەرگدا کە گیان دەگاتە قورگ ﴿٨٣﴾ وە ئێوەش لەو کاتەدا سەیری دەکەن ﴿٨٤﴾ وە ئێمەیش (بە فریشتەکانمانەوە) نزیك ترین لێیەوە تاوەکو ئێوە بەلام ئێوە نایانبینن ﴿٨٥﴾ وە ئەگەر ئێوە باوەڕتان نی‌یە بە زیندوو بوونەوە و لێ‌پرسینەوە و پاداشت وەرگرتنەوە ﴿٨٦﴾ ئەوا ئەو گیانە بگێڕنەوە بۆ ناو ئەو لاشەیەی کە لێیەوە دەرهێنرا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ﴿٨٧﴾ جا ئەگەر ئەو کەسە لەوانە بێت کەوا زۆر نزیکن لە خواوە* ﴿٨٨﴾ ئەوا خۆشی (ئیسراحەت و ئارامی) و بۆنی ڕەیحان و بەهەشتی خۆشگوزرانییان پێ‌دەدرێت .

وە لە (البراء بن عازب)ەوە (ﷺ) : پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە باوەڕدار ئەگەر وەلامی دوو فریشتەکەی دایەوە فەرموویەتی : «فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنْ السَّمَاءِ أَنْ صَدَقَ عَبْدِي ، فَأَفْرِشُوهُ مِنْ الْجَنَّةِ ، وَأَلْبِسُوهُ مِنْ الْجَنَّةِ ، وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى الْجَنَّةِ ، قَالَ : فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا ، وَيُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ مَدَّ بَصَرِهِ»[١٨].

واتە : بانگکارێك بانگ دەکات لە ئاسمانەوە : بەندەکەم ڕاستی کرد ، ڕاخەن بۆی لە فەرشی بەهەشت ، بیپۆشن لە پۆشاکی بەهەشت ، دەرگایەکی بۆ بکەنەوە بەرەو بەهەشت ، فەرمووی : لە خۆشی و بۆنی بەهەشتی بۆ دێت و گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێتەوە تاوەکو چاو بڕبکات .

---

* (ئەوانەن کەوا فەرز و سوننەتەکانیش ئەنجام دەدەن و وازدەهێنن لە حەرام و مەکروهەکانیش) .
بڕوانە : (تفسیر ابن کثیر) و (تفسیر السعدي) .

[١٨] رواه أحمد ، مسند البراء بن عازب ، رقم : (١٨٠٦٣) ، وأبو دواد ، كتاب السنة ، باب المسألة في القبر وعذاب القبر ، رقم : (٤٧٥٣) .

*** وە خەڵکانێك لە لاڕێبووان گومڕا بوونە و نکۆڵی** (ئینکاری) **سزا و خۆشی گۆڕ دەکەن :** بۆچوونیان وایە کەوا ئەمە مەحاڵە چونکە پێچەوانەی واقعە ، دەڵێن : ئەگەر مردووەکە سەرهەڵدرێتەوە و دەربخرێت لە نێو گۆڕەکەیدا ئەوا دەبینرێت چۆن بووە هەر وەکو خۆی وایە ، وە گۆڕەکە نەگۆڕاوە نە بە فراوان بوونەوە و نە بە تەنگ بوونەوەش .

ئەم بۆچوونەش پوچەڵە ، بە پێی شەرع و هەست و عەقڵ :

**لایەنی شەرع :** ئەوا ئەو دەقانەی کەوا بەڵگەن لەسەر سەلماندنی سزا و خۆشی گۆڕ لە پێشەوە باس کران .

وە لە (صحيح البخاري)دا لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە (ﷺ) فەرموویەتی : «خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ بَعْضِ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ ، فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا» باسی تەواوی فەرموودەکەی کرد کە تێیدا هاتووە : «كَانَ أَحَدُهُمَا لاَ يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ» ــ وفي رواية : «مِنْ بَوْلِهِ» ، وفي رواية لمسلم : «لاَ يَسْتَنْزِهُ مِنْ بَوْلِهِ» ــ ، وَكَانَ الآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ»[١٩] .

**واتە :** پێغەمبەر (ﷺ) لە هەندێك لە باخەکانی دەوروبەری مەدینەدا هاتەدەرەوە و لە ناکاودا دەنگی دوو مرۆڤی بیست کەوا لە نێو گۆڕەکانیاندا سزا دەدران ...

وە فەرمووی : یەکێکیان خۆی نەدەپاراست و خۆی پاکڕانەدەگرت لە میزەکەی ، وە ئەوەی تریان قسەی لە نێوان خەڵکدا دەهێنا و دەبرد بە مەبەستی زیان گەیاندن .

---

[١٩] رواه البخاري ، كتاب الأدب ، باب النميمة من الكبائر ، رقم : (٥٧٠٨) ، ورواه مسلم ، كتاب الطهارة ، باب الدليل على نجاسة البول ووجوب الاستبراء منه ، رقم : (٦٧٦) .

وە **لایەنی هەست** : ئەوا بەڕاستی مرۆڤی خەوتوو لە کاتی خەوتنیدا دەبینێت کەوا لە نێو شوێنێکی فراوان و زۆر خۆشدایە و خۆشدەگوزرێت تێیدا ، یان لە نێو شوێنێکی تەنگ و سامناکدایە و ئازاری پێ دەچێژێت ، وە لەوانەیە هەندێك جار بەخەبەر بێتەوە بە هۆی ئەوەوە کە بینیویەتی لە خەوەکەیدا ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەر لەسەر جێگەکەی خۆیدایە لە نێو ژوورەکەی خۆیدا بەو شێوەیەی کە لەسەری بووە ، وە خەو برای مردنە ، لەبەر ئەمە خوای گەورە ناوی ناوە بە (مردن) ، خوای گەور فەرموویەتی :

﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ (٤٢) ﴾ [الزمر] .

واتە : خوا گیانەکان دەکێشێت لە کاتی مردنیاندا و ئەوەش کە نەمردووە لە کاتی خەوتنیاندا ، جا ئەوەیان دەگرێتەوە کەوا بڕیاری مردنی بەسەردا داوە و ئەوەی تریشیان بەردەدات بۆ کاتی ناو براوی خۆی .

وە **لایەنی عەقڵ** : ئەوا بەڕاستی مرۆڤی خەوتوو لە کاتی خەوتنیدا خەوی ڕاست دەبینێت کەوا لەگەڵ واقعدا دەقاودەق وەك یەکن ، وە هەندێك جار پێغەمبەر (ﷺ) دەبینێت لەسەر شێوازی خۆی ، وە هەر کەسێکیش بیبینێت لەسەر شێوازی خۆی ئەوا بەڕاستی بینیویەتی ، لەگەڵ ئەوەشدا کەسی خەوتوو هەر لە نێو ژوورەکەی خۆیدایە و لەسەر جێگەکەی خۆیدا دوورە لەوەی کە بینیویەتی ، جا ئەگەر ئەمە ڕوودانی شیاو بێت لە بوارەکانی دونیادا ، ئایا ڕوودانی شیاو نییە لە بوارەکانی دواڕۆژدا ؟

وە ئەوەی کە پشتیان پێبەستووە لە بۆچوونەکەیاندا کەوا ئەگەر مردووەکە سەرهەڵدرێتەوە و دەربخرێت لە نێو گۆڕەکەیدا ئەوا دەبینرێت

چۆن بووه هەر وەکو خۆی وایە ، وە گۆڕەکە نەگۆڕاوە نە بە فراوان بوونەوە و نە بە تەنگ بوونەوەش ، ئەوا **وەڵامەکەی لە چەند رووبەکەوەیە :**

**یەکەم :** ئەوەیە کە بەڕاستی نابێت بەرهەڵستی ئەوە بکرێت کە شەرع پێی هاتووە بە نموونەی ئەم گومانە هەڵوەشێنراوانە کەوا ئەگەر ئەو کەسەی بەرهەڵستکاریان پێدەکات تێڕابمێنێت تێڕامانێکی پێویست و بە ووردی بیربکاتەوە لەو بەڵگانەی کەوا شەرع پێیان هاتووە ئەوا بەدڵنیایی پووچەڵێتی ئەم گومانانە دەزانێت ، وە وتراوە :

وكَمْ مِنْ عائِبٍ قولاً صحيحاً     وآفتهُ من الفَهمِ السقيمِ

واتە : چەندین کەس هەیە وتەیەکی ڕاست لەکەدار (عەیبدار) دەکات .. ئەهامەتێکەشی لە لاوازی تێگەیشتنەکەیەتی .

**دووەم :** بەڕاستی بارودۆخەکانی (حاڵەتەکانی) ژیانی نێو گۆڕ (بەرزەخ) بەشێکن لە بوارەکانی پەنهانی (غەیب) کەوا هەست پەییان پێنابات و دەرکیان پێناکات ، وە ئەگەر بوارەکانی غەیب بە هەست پەییان پێببرایەت و دەرکیان پێبکرایەت ئەوا سوودی باوەڕهێنان بە غەیب نەدەما و لەو کاتەشدا باوەڕهێنەران بە غەیب و نکۆڵیکەران لە بەڕاستخستنەوەیدا یەکسان دەبوون .

**سێیەم :** بەڕاستی سزا و خۆشی و فراوانی و تەنگی گۆڕ تەنها مردووەکە هەستی پێدەکات و بەس ، وە ئەمەش وەکو ئەوە وایە کە خەولێکەوتوو لە خەوەکەیدا خۆی دەبینێت کەوا لە شوێنێکی تەنگ و سامناکدایە یان لە شوێنێکی فراوان و خۆشدایە ، بەڵام ئەو کەسەی کە لە

دەورو‌بەریدایە ئەمە نابینێت و هیچ هەستی پێناکات ، وە پێغەمبەر (ﷺ) وەحیی بۆ دەنێردرا لە کاتێکدا کە لە نێوان هاوەڵەکانیدا بوو ئەو وەحییەکەی دەبیست بەڵام هاوەڵانی نەیاندەبیست ، وە هەندێك جار فریشتەکە خۆی بۆی دەنواند لە شێوەی پیاوێکدا و قسەی لەگەڵیدا دەکرد کە چی هاوەڵانیش فریشتەکەیان نەدەبینی و گوێیشیان لێینەدەبوو .

**چوارەم** : بەڕاستی پەیپێبردن و توانای هەست کردنی دروستکراو سنووردارە بە ئەوەندەی کە خوای گەورە توانای پێداون لە پەیپێبردن و هەست پێ کردن ، وە مەحاڵە بتوانن هەست بکەن بە هەموو ئەو شتانەی کە بوونیان هەیە ، ئەوەتە هەر حەوت ئاسمانەکە و زەوی و ئەوانەش کە لە نێوانیاندا هەن و هەموو شتێك تەسبیحات و ستایشی خوا دەکەن تەسبیحاتێکی ڕاستەقینە ، کە خوای گەورە هەندێك جار دەیدات بە گوێی ئەوانەی کە ویستی لێبیێت لە دروستکراوەکانی ، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە داپۆشراوە و شاردراوەتەوە و پەنهانکراوە لە ئێمە ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ ﴿٤٤﴾﴾ [الإسراء] .

واتە : هەر حەوت ئاسمانەکە و زەوی و ئەوانەش کە لە نێوانیاندا هەن تەسبیحاتی خوا دەکەن ، وە هیچ شتێك نییە ئیللا تەسبیحات و ستایشی خوا دەکات ، بەڵام ئێوە لە تەسبیحاتی ئەوان تێناگەن .

هەروەها شەیتانەکان و جنۆکە بە سەر زەویدا دێن و دەڕۆن ، وە جنۆکە ئامادە بوون لە لای پێغەمبەر (ﷺ) و گوێیان گرت بۆ قورئان خوێندنەوەکەی و بێدەنگ بوون بۆی ، پاشان گەڕانەوە بۆ لای گەلەکەیان

و ئاگاداريانييان كردەوە ، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان شاردراونەتەوە و پەنهانكراون لە ئێمە ، وە سەبارەت بەمەش خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ [الأعراف] .

واتە : ئەی ئادەمیزاد وریا بن شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێت بە ڕازاندنەوەی تاوان بۆتان وەکو چۆن باوە و دایە گەورەتانی (ئادەم و حەوا) لە بەهەشت دەرهێنایە دەرەوە و پۆشاکەکانیانی پێداکەندن بۆ ئەوەی عەورەتی خۆیانیان پێپیشان بدات ، بەڕاستی ئەو و هاوشێوەکانی لە جنۆکە ئێوە دەبینن لە کاتێکدا کە ئێوە ئەوان نابینن ، بەڕاستی ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە دۆست بۆ ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن .

جا ئەگەر دروستکراوەکان پەی نەبەن و هەست نەکەن بە هەموو ئەو شتانەی کە هەن ، ئەوا بە دڵنیایی نابێت ئینکاری ئەو شتانە بکەن کە سەلمێنراون لە بوارەکانی پەنهانی (غەیب) و ئەوان پەییان پێنابەن و دەرکیان پێناکەن .

# باوەڕبوون بە قەدەر

**قەدەر** : بریتی‌یە لە ئەندازەگیری خوای گەورە بۆ بونەوەران ، بە پێی زانستی پێش وەختی بۆ ئەو ئەندازەگیریە ، وە بەو شێوەیەی کە دانایی خوا خواستویەتی .

**وە باوەڕبوون بە قەدەر چوار بوار دەگرێتەوە :**

**یەکەم** : باوەڕبوون بەوەی کە خوای گەورە زانایە بە هەموو شتێك ، بە گشتی و بە ووردیش ، بە هەمیشەیی و هەتاهەتاییش ، جا ئەمە لەوانەدا کە پەیوەندییان بە کردارەکانی خواوە هەبێت یان بە کردارەکانی بەندەکانیەوە هەبێت یەکسانن .

**دووەم** : باوەڕبوون بەوەی کە خوای گەورە ئەو زانیارییانەی نووسیوەتەوە لە نێو کتێبی پارێزراودا (اللوح المحفوظ) ، وە سەبارەت بەم دوو بوارە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ۝٧٠﴾ [الحج] .

واتە : ئایا نەت زانیوە کە بەڕاستی خوا زانا و ئاگادارە بە هەموو ئەو شتانەی لە نێو ئاسمان و زەویدایە ، بەڕاستی ئەمە لە کتێبی (لوح المحفوظ)دایە ، بەڕاستی ئەمە بە لای خواوە ئاسانە .

وە لە (صحيح مسلم)دا لە (عبد الله بن عمرو بن العاص)ەوە (رضي الله عنهما) فەرموویەتی : بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : ((كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ))[٢٠] .

---

[٢٠] رواه مسلم ، كتاب القدر ، باب حجاج آدم وموسى عليهما السلام ، رقم : (٦٦٩٠) .

واتــه : خــوا چارەنووســی دروســتکراوەکانی نووســیوە پــێش ئــەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات بە پەنجا هەزار ساڵ .

**سێیەم** : باوەڕبوون بـەوەی کـە هـەموو ڕووداوەکـان (ئـەو شـتانەی کـە دەبن) ڕوونادەن و نابن ئیللا بە ویـستی خـوای گـەورە نـەبێت ، جا چ ئـەوە لەو شتانەدا بێت کە پەیوەندیان هەیـە بـە کـرداری خـواوە یـان پەیوەنـدیان هەیـە بـە کـرداری دروسـتکراوەکانەوە یەکسانن ، خـوای گـەورە سـەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بە کرداری خۆیەوە هەیـە فەرموویـەتی : ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۝٦٨﴾ [القصص] .

واتە : وە پەروەردگارت ئەوەی کە ویستی لـێ‌ی ببێت دروسـتی دەکـات و ئەوەش هەڵدەبژێرێت کە ویستی لێیەتی .

وە فەرموویەتی : ﴿وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ۝٢٧﴾ [ابراهيم] .

واتە : خوا ئەوەی کە ویستی لـێ‌ی ببێت دەیکات .

وە فەرموویـــەتی : ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ ۝٦﴾ [آل عمران] .

واتە : خوا ئەو کەسەیە کە شێوەتان دیاری دەکات لە مناڵدانی دایکانـدا بەو شێوازەی کە ویستی لـێ‌ی ببێت .

وە خــوای گــەورە ســەبارەت بــەوەی کــە پەیوەنــدی بــە کــرداری دروســـتکراوەکانەوە هەیـــە فەرموویـــەتی : ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۝٩٠﴾ [النساء] .

واتە : وە ئەگەر خوا ویستی لـێ ببێـت ئـەوا بێباوەڕەکـان دەســەڵاتدار دەکات بە سەرتـانـەوە و ئەنـجا لەگەڵـتاندا دەجەنگان .

وە فەرموویەتی : ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾﴾ [الأنعام] .

واتە : وە ئەگەر پەروەردگارت ویستی لێ ببێت ئەوا ئەو کارانەیان نەدەکرد ، بۆیە تۆ وازبێنە لە خۆیان و لەوەش کە هەڵیدەبەستن .

**چوارەم** : باوەڕبوون بەوەی کە هەموو بونەوەر و ڕووداوەکان (ئەو شتانەی کە دەبن) دروستکراوی خوای گەورەن بە خوودی خۆیان و سیفەتەکانیان و جموجوڵیانیشەوە ، خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾﴾ [الزمر] .

واتە : خوا بەدیهێنەر و دروستکاری هەموو شتێکە ، وە بەسەر هەموو شتێکەوە وەکیلە .

وە خوای پاك و بێکەم وکوڕی فەرموویەتی : ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ [الفرقان] .

واتە : وە خوا هەموو شتێکی دروست کردووە و ئەندازەشی بۆ داناوە .

وە خوای گەورە سەبارەت بە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) کە بە گەلەکەیی وتوە : فەرموویەتی : ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ [الصافات] .

واتە : خوا ئێوەی دروست کردووە و ئەوەش کە دەیکەن .

* وە **باوەڕبوون بە قەدەر** - بەو شێوەیەی کە باسمان کرد - ئەوە ڕەد ناکاتەوە کەوا بەندە ویستی هەبێت لەو کردارانەیدا کە هەڵبژاردەی خۆیین و توانای هەبێت بەسەریاندا ، چونکە شەرع و واقع هەردووکیان بەڵگەن لەسەر سەلماندنی ئەمە بۆی :

**لایەنی شەرع** : ئەوا خوای گەورە سەبارەت بە ویستی بەندە فەرموویەتی: ﴿فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾﴾ [النبأ] .

واتـه : هـەر کەسـێ ویـستی لـێ بێـت گەڕانـەوە بـۆ لای پـەروەردگاری هەڵدەبژێرێت .

وە فەرموویەتی : ﴿فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ [البقرة] .

واتە : بچنە لای جێی تۆوەکانتان چۆن دەتانـەوێت (ویستان لەسـەری هەیە) .

سەبارەت بە توانای بەندەیش خوای گەورە فەرموویـەتی : ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ وَٱسْمَعُوا۟ وَأَطِيعُوا۟ ﴿١٦﴾﴾ [التغابن] .

واتە : لە خوا بترسن ئەوەنـدەی لـە تواناتانـدا هەیـە ، وە گـوێ بگـرن و گوێ ڕایەڵ بن .

وە فەرموویـــەتی : ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ ﴿٢٨٦﴾﴾ [البقرة] .

واتە : خوا ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك ئیللا بە پـێی توانای نـەبێت ، پاداشـتی ئـەوەی بۆ هەیـە کـە کردوویـەتی لـە چـاکە و پاداشـتی ئەوەشـی لەسەرە کە کردوویەتی لە خراپە .

وە **لایەنی واقع** : ئەوا بەڕاستی هەموو مرۆڤێك دەزانێت کە خۆی ویـست و توانـای هەیـە ، بـە هـەردووکیان کـردار دەکـات ، وە بـە هـەردووکیان واز دێنێت لە کردار کردن ، وە بە هەردووکیان جیاوازی دەکات لە نێوان ئـەوەی کـە ڕوودەدات بـە پـێی ویـستی خـۆی وەکـو ڕێکـردن لەگـەڵ ئـەوەدا کـە ڕوودەدات بە بـێ ویـستی خـۆی وەکـو لـەرزلێهاتن ، بـەڵام ویـست و توانـای بەندە بە ویست و توانای خوای گـەورە بەدیـدێن ، لەبـەر فەرمایـشتی خـوای

گـــەورە : ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ [التكوير].

واتە : بۆ هەر کەسێك لە ئێوە کە ویستی هـەبێت ڕاسـت بێتـەوە ﴿٢٨﴾ وە نـاتوانن ویـستان هـەبێت ئـیللا مەگـەر خـوای پـەروەردگاری هـەموو جیهـان ویستی لـێ‌ی ببێت .

وە لەبـەر ئـەوەی گـەردوون هـەمووی مـوڵکی خوایـە هـیچ شتێك لـە نێـو موڵکی خوادا نابێت بە بێ زانیاری و ویستی ئەو .

* وە **باوەڕبوون بە قـەدەر** ـ بـەو شـێوەیەی کـە باسمـان کـرد ـ بەڵگـە و بیانو نابەخشێت بە بەنـدە بـۆ وازهێنـانی لـەو کارانـەی کـە پێویـست کـراون لەسەری ، یان بۆ ئەنجامدانی تاوانەکان ، بـە پـێ‌ی ئـەمـە کردنـی قـەدەر بـە بیانو لە لایەن ئەو جۆرە کەسانەوە پووچەڵە لە چەند ڕوویەکەوە :

**یەکەم** : خوای گـەورە فـەرموویـەتی : ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾﴾ [الأنعام] .

واتـە : ئەوانـەی کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـنن دەڵـێن : ئەگـەر خـوا بیویـستایە ئێمـە و بـاب و باپیرانمـان هاوبـەشمان (بـۆ خـوا) دانـەدەنا ، وە هەروەها ئەگەر خوا نەی ویستبایە ئێمـە هـیچ شتێکمان لـە خۆمـان حـەرام نەدەکرد ، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆیان دەکرد و هـەمان قسەیان دەوت هەتا سزا و تۆڵەی ئێمەیان چەشت ، (ئـەی پێغەمبـەر) بڵـێ : ئایا هیچ بەڵگە و زانیاریەکتان لایـە دەری خـەن بۆمـان ، ئێـوە شـوێنی هـیچ

شتێك ناكەون جگە لە گومان نەبێت ، وە ئەوەی ئێوە دەیڵێن لـە درۆ زیـاتر هیچ شتێكی تر نیـیە .

كەواتە ئەگەر قەدەر بەڵگە ببوایەت بۆیان ئەوا خوا سزا و تۆڵـەی پێیـان نەدەگەیاند .

**دووەم** : خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ [النساء] .

واتە : پێغەمبەرانێك كە موژدەدەر و ئاگاداركەرەوەن بۆ ئەوەی خـەڵكی بیانویان بە دەستەوە نەبێت لە لای خـوا لـە پـاش نـاردنی پێغەمبـەران ، وە خوا بەدەسەڵات و دانایە .

كەواتە ئەگەر قەدەر بەڵگە ببوایەت بۆ پێچەوانەكەرانی پێغەمبەران ئەوا ئەو بیـانووە بـە نـاردنی پێغەمبـەران لانەدەچـوو ، چونكە پێـچەوانە كـردن دوای ناردنیان رووی داوە بە قەدەری خوای گەورە .

**سێیەم** : ئەوەی كـە (البخاري ومسلم ــ واللفظ للبخاري ــ) گێڕاویانەتـەوە لە (علي بن أبـــي طالب)ەوە (ﷺ) كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (( مَـــا مِنكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ ، فَقُلْنَا : يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نَتَّكِلُ ؟ قَالَ : لاَ ، اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ ، ثُمَّ قَرَأَ : ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ [الليل] ))[٢١] .

واتە : هیچ یەكێك لە ئێوە نییە ئیللا جێگای لە بەهەشتدا و جێگای لە

[٢١] رواه البخاري ، كتاب التفسير ، باب تفسير (فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى) رقـم : (٤٩٤٧) ، ورواه مسـلم ، كتاب القدر ، باب كيفية خلق الآدمي وكتابة أجله ، رقم : (٦٦٧٥) .

دۆزەخدا نووسراوە ، وتمان : ئەی پێغەمبەری خوا : ئایا بۆ پاڵیلێنەدەینەوە و پشت بەو نووسینە ببەستین ؟ فەرمووی : نەخێر ، کردەوە بکەن چونکە هەموو کەسێك بەڕێخراوە ، ئەنجا ئەم ئایەتانەی خوێندەوە : بەڵام ئەو کەسەی کەوا دەبەخشێت و خۆپارێزی دەکات لە تاوان و لە خوا دەترسێت ۞ وە باوەڕی هەیە بە (لا إلـــهَ إلاَّ الله / واتە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ـ الله ـ نەبێت) [یان باوەڕی هەیە بە (بەهەشت و پاداشتی چاکەکاری)] ۞ ئەوا هەموو چاکەکارییەکی بۆ ئاسان دەکەین و یارمەتی دەدەین بۆ ئەنجامدانی هەموو خێرێك و دوورکەوتنەوە لە هەموو خراپەیەك ۞ بەڵام ئەو کەسەی کەوا ڕەزیلی دەکات و خۆی بێ‌پێویست دەکات لە خوا (پێویستی خۆی بۆ خوا دەرنابڕێت) ۞ وە باوەڕی نییە بە (لا إلـــهَ إلاَّ الله / واتە : هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ـ الله ـ نەبێت) [یان باوەڕی نییە بە (بەهەشت و پاداشتی ڕۆژی دوایی)] ۞ ئەوا هەموو خراپەکارییەکی بۆ ئاسان دەکەین و یارمەتی نادەین بۆ ئەنجامدانی خێر و چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپە .

(وفي لفظ لـمسلم) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِـمَا خُلِقَ لَـهُ)) [صحيح مسلم رقم : (٢٦٤٧)] .

واتە : کردەوە بکەن چونکە هەموو کەسێك بەڕێخراوە بۆ ئەوەی کە بۆی دروستکراوە .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە بە کردەوە کردن ، و ڕێگری کردووە لە پشت بەستن بە قەدەر .

**چوارەم** : بەڕاستی خوای گەورە فەرمانی کردووە بە بەندە و ڕێگریشی لێکردووە ، وە ئەرکی نەخستووەتە سەر جگە لەوە نەبێت کە لە توانایدایە ، خوای گەورە فەرمووییەتی : ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا ﴿١٦﴾﴾ [التغابن] .

واتە : لە خوا بترسن ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە ، وە گوێ بگرن و گوێڕایەڵ بن .

وە فەرموویەتی : ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾﴾ [البقرة] .

واتە : خوا ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك ئیللا بە پێی توانای نەبێت .

کەواتە ئەگەر بەندە ناچارکراو و زۆرلێکراو ببوایەت لەسەر کردووە کردن ، ئەوا ئەرك لەسەر (تەکلیفلێکراو) دەبوو بەوەی کە لە توانایدا نییە رزگاری ببێت لێی ، وە ئەمەش پووچەڵە ، وە لە بەر ئەوە ئەگەر سەرپێچییەکی لێوەشایەوە بە نەزانی یان بە لەبیرچوونەوە یان بە زۆرپێکردن ئەوا تاوانی لەسەر نییە ، چونکە بیانووی هەیە .

**پێنجەم** : بەڕاستی قەدەری خوا نهێنییەکی شاراوەیە پێی نازانرێت ئیللا دوای ڕوودانی ئەوە نەبێت کە دانراوە ببێت ، وە ویستی بەندە بۆ ئەو کارەی کە دەیکات پێش کردنەکەی کەوتووە ، بۆیە ویستی بەندە بۆ کردار بنیات نەنراوە لەسەر زانیاری ئەو بەندەیە بە قەدەری خوا ، کەواتە لەم کاتەدا قەدەر کردن بە بیانو لە لایەن ئەو کەسەوە نامێنێت و پووچەڵ دەبێتەوە ، چونکە بەڵگە و بیانو نییە بۆ کەسێك لە شتێکدا کە نایزانێت .

**شەشەم** : بەڕاستی ئێمە دەبینین مرۆڤ سوورە لەسەر ئەوەی کە گونجاوە بۆی لە بوارەکانی دونیایدا تاوەکو پێی دەگات و دەستی

دەكەوێت ، وە لەوە لانادات بۆ ئەوەی كە نەگونجاوە بۆی ، ئەنجا بۆ ئەم لادانەی قەدەر بكات بە بەڵگە !

باشە بۆ چی خۆی لادەدات لەوەی كە سوودی بۆی هەیە لە بوارەكانی ئاینەكەیدا بۆ ئەوەی كە زیانی پێدەگەیەنێت ئەنجا قەدەر دەكاتە بەڵگە ؟ ئایا باری هەردوو بوارەكە یەكێك نین* ؟

ـ ئەوە نموونەیەكە بۆ تۆ كە ئەمەت بۆ ڕوون دەكاتەوە :

ئەگەر لەبەر دەستی مرۆڤدا دوو ڕێگا هەبێت :

یەكێكیان : دەیگەیەنێتە وڵاتێك كە هەمووی پشێوی و هەر كەس بۆ خۆیە : كوشتن و تاڵان كردن و ئابڕووبردنی ناموس و ترس و برسێتی تێدایە .

دووەمیان : دەیگەیەنێتە وڵاتێك كە هەمووی یاسا و ئاسایش تێیدا بەرقەرارە و ژیانی خۆشە و ڕێز گرتنی تێدایە بۆ گیان و ناموس و ماڵ و سامانەكان ، ئایا كام ڕێگایەیان دەگرێتەبەر ؟

بەدڵنیایی ڕێگای دووەمیان دەگرێتەبەر كە دەیگەیەنێتە وڵاتی یاسا و ئاسایش ، وە هەرگیز مومكین نی یە بۆ هیچ كەسێكی ژیر كەوا ڕێگای وڵاتی

---

* مەبەستی ئەوەیە بۆ هەڵبژاردنی لایەنی چاكە و دوور كەوتنەوە لە خراپە لە بواری دونیادا دەڵێت بە ویست و بڕیار و توانای خۆم كردوومە و خۆم سەرپشك بوومە تێیدا ، بەڵام لە بواری ئاین و دینداری دا بۆ ئەنجامدانی خراپە و دوور كەوتنەوە لە چاكە ناڵێت بە ویست و بڕیار و توانای خۆم كردوومە بەڵكو دەڵێت بە پێی قەدەر بووە و خوا لە چارەمی نووسیوە كە من خراپەكار بم و چاكەكار نەبم !!!

بەڕاستی ئەمە بانێكە و دوو هەوا ! چونكە لە بواری ئاین و دینەكەیشدا هەر بە ویست و بڕیار و توانای خۆی خراپەی كردووە و چاكەی نەكردووە ، كەس نی یە بتوانێت نكوڵی لە ئەمە بكات مەگەر كەسێكی زۆر بێعەقڵ و گێل و گەمژە نەبێت . ـ وەرگێڕ ـ

پشێوی و هەر کەس بۆ خۆی و ترس بگرێتەبەر و قەدەر بکات بە بەڵگە و بیانو !

ئایا لەبەر چی لە بواری دوارِۆژدا رێگای ئاگری دۆزەخ دەگرێتەبەر جگە لە بەهەشت و قەدەر دەکات بە بەڵگە ؟

ـ نموونەیەکی تر : دەبینین نەخۆش فەرمانی پێدەکرێت بە دەرمان خواردنەوە ، ئەویش دەیخواتەوە لە کاتێکدا کە دڵی نایبات و ئارەزووی ناکات ، وە ئەو خواردنەی لێ قەدەغە دەکرێت کە زیانی پێدەگەیەنێت ، ئەویش وازی لێ دێنێت لە کاتێکدا کە دڵی دەیبات و ئارەزووی دەکات ، هەموو ئەمانە ئەنجام دەدات بە مەبەستی داخوازی شیفا و چاك بوونەوە و سەلامەتی ، وە مومکین نی یە کەوا خۆی بگرێتەوە لە خواردنەوەی دەرمان ، یان ئەو خواردنە بخوات کە زیانی پێدەگەیەنێت و قەدەر بکات بە بەڵگە و بیانو !

ئایا لەبەر چی مرۆڤ واز دێنێت لەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێکردووە یان ئەوە ئەنجام دەدات کە خوا و پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردووە ئەنجا قەدەر دەکات بە بەڵگە ؟

**هەوتەم** : بەڕاستی ئەو کەسەی کە قەدەر دەکات بە بیانو بۆ وازهێنانی لەوەی کە وازی لێهێناوە لە پێویستکراوەکان (الواجبات) ، یان ئەوەی کە ئەنجامی دەدات لە تاوانەکان ، ئەگەر کەسێك دەست درێژی بکاتە سەری و ماڵەکەی ببات یان ئابڕوی ببات و ناوبانگی بڕوشێنێت ، ئەنجا قەدەر بکاتە بەڵگە و بڵێت : سەرزەنشتم مەکە ! چونکە دەست درێژی کردنەکەم بە قەدەری خوا ڕووی داوە ! ئەوا بیانوەکەی لێقبوڵ ناکرێت .

باشە چۆن بیانو هێنانەوە بە قەدەر لە جگە لە خۆی قبوڵ ناکات بۆ دەست درێژی کردنی بۆ سەری ، وە خۆی بۆ خۆی قەدەر دەکاتە بیانو لە دەست درێژی کردنیدا بۆ سەر مافی خوای گەورە ؟!

وە دەگێڕنەوە لە پێشەوای باوەڕدارانەوە (عمر بن الـخطاب ﷺ) کەوا دزێکیان هێناوە بۆ لای کە شایستەی دەست بڕینەوە بووە ، بۆیە فەرمانی کرد بە بڕینەوەی دەستی ، ئەویش وتی : پەلەمەکە ئەی پێشەوای باوەڕداران چونکە بەڕاستی من بە قەدەری خوا دزیم کردووە ! عومەریش فەرمووی : بەڕاستی ئێمەیش بە قەدەری خوا دەستت دەبڕین .

وە **باوەڕبوون بە قەدەر** چەندین بەرهەمی گەورەی هەیە ، لەوانە :

**یەکەم** : پشت بەستن بە خوای گەورە لە کاتی ئەنجامدانی هۆکارەکاندا ، بە شێوەیەك کە پشت نەبەسترێت بە خوودی هۆکارەکە خۆیەوە ، چونکە هەموو شتێك بە قەدەری خوای گەورە دەبێت .

**دووەم** : کەوا مرۆڤ سەرسام نەبێت بە خۆیەوە لە کاتی بەدیهاتنی مەبەستەکەیدا ، چونکە بەدیهاتنی مەبەستەکەی نیعمەتێکە لە لایەن خوای گەورەوە بەوەی کە ڕێکیخستووە و دایناوە لە هۆکارەکانی چاکە و سەرکەوتن ، بەڵام سەرسام بوونی بە خۆیەوە شوکر و سوپاسی ئەم نیعمەتەی لە بیر دەباتەوە .

**سێیەم** : ئارامی و ئیسراحەتی دەروونی بەوەی کە دێت بەسەریدا لە قەدەرەکانی خوای گەورە ، جا بێزار و شپرز نابێت بە لەدەست چوونی خۆشویستراوێك یان بە ڕوودانی نەخواستراوێك ، چونکە ئەمە بە قەدەری خوا دەبێت کە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی ئەوە ، وە ئەوە دەبێت

ببێت و هیچ ڕێگاچارەیەك نی‌یە بۆ ڕوونـەدانی ، وە سەبارەت بەمە خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾﴾ [الحديد] .

واتە : هیچ بەلایەك ڕوونادات لە زەویدا و لە خوودی خۆیشتاندا ئیللا لـە كتێبی (اللوح المحفوظ)دا نووسراوەتەوە پێش ئـەوەی دروسـتی بكـەین ، بەڕاستی ئەمە بە لای خواوە ئاسانە ﴿٢٢﴾ بۆ ئـەوەی خـەم نـەخۆن بـۆ ئـەوەی كە لە دەستان دەچێت و دڵخۆشیش نەبن بەوەی كە پێتان دراوە ، وە خوا هەموو خۆبەگەورەزان و شانازیكەرێكی خۆش ناوێت .

وە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : «عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ»[٢٢] .

واتە : سەرسوڕمان بۆ باری بـاوەڕدار بەڕاسـتی هـەموو بـارێكی خێـرە ، وە ئەمەش بۆ كەس نی‌یە تەنها بـۆ بـاوەڕدار نـەبێت ، ئەگـەر خـۆشی‌یـەكی تووش ببێت سوپاسی خوا دەكات ئەمەش خێـرە بـۆی ، وە ئەگـەر زیـانێكی تووش ببێت ئارام دەگرێت ئەمەش خێرە بۆی .

---

[٢٢] رواه مسلم ، كتاب الزهد والرقائق ، باب المؤمن أمره كله خير ، رقم : (٧٤٢٥) .

*** وە لە بواری قەدەردا دوو تاقم گومڕا بوون :**

**یەکەمینیان** : (الـــــجبرية) : ئەوانەی کە وتویانە بەندە ناچار و زۆرلێکراوە بۆ ئەنجامدانی کردەوەکانی ، وە هیچ ویست و توانای خۆیی تێدا نی‌یە .

**دووەمینیان** : (القدرية) : ئەوانەی کە وتویانە بەندە بە ویست و توانای خۆی سەربەخۆیە لە ئەنجامدانی کردەوەکانیدا ، وە هیچ کاریگەری ویست و توانای خوای گەورەی لەسەر نی‌یە تێیدا .

**وەڵامدانەوەی تاقمی یەکەم (الـجبرية) بە شەرع و واقع دەبێت :**

**لایەنی شەرع** : ئەوا بەڕاستی خوای گەورە ئەوەی سەلماندووە کەوا بەندە ویستی هەیە ، وە کردەوەشی داواتە پاڵی‌یەوە ، خوای گەورە فەرموویـــــەتی : ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ ۚ ﴿١٥٢﴾﴾ [آل عمران] .

واتە : هەندێك لە ئێوە دونیای دەوێت و هەندێکی دیکەیشتان دوارۆژی دەوێت .

وە فەرموویەتی : ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّـٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ﴿٢٩﴾﴾ [الكهف] .

واتە : ئەی پێغەمبەر بڵێ بە خەڵکی : ئەمەی کە پێتانی ڕادەگەیەنم ڕاستە و لای پەروەردگارتانەوە هێناومە ، جا هەر کەسێك دەیەوێت باوەڕ بێنێت با باوەڕ بێنێت وە هەر کەسێکیش دەیەوێت باوەڕ نەهێنێت با باوەڕ نەهێنێت ، بەڕاستی ئێمە ئاگرێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران کەوا چواردەوری داون بە پەرژینەکانی و ناتوانن لێی دەرباز بن .

وه فەرموویـــــــەتی : ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾ [فصلت] .

واتــە : هــەر کەسـێك کـردەوەی چـاکە ئەنجامبـدات ئــەوە بـۆ خـۆی کردوویەتی ، وە هـەر کەسـێك خراپـە بکـات ئـەوە لەسـەری دەکـەوێت ، وە پەروەردگارت هەرگیز ستەمکار نی‌یە لە بەندەکان .

وە **لایەنی واقع** : ئەوا بەڕاستی هەموو مرۆڤێـك دەزانێـت جیـاوازی هەیـە لە نێوان کردارە هەڵبژێردراوەکانی کە بە ویستی خـۆی ئـەنجامیان دەدات : وەکو خواردن و خواردنەوە و کڕین و فرۆشـتن ، لەگـەڵ ئـەو کردارانەیـدا کـە دەکەونە سەری بە بێ ویستی خۆی : وەکو لەرزلـێهاتن لە کـاتی تالـێهاتن و کەوتنە خوارەوە لە سەریانەوە ، ئەو لە یەکەمیانـدا (فاعِلٌ مُختارٌ بإرادتهِ من غیرِ جَبْرٍ) ئەنجامدەر و سەرپشکە بە ویستی خۆی بـە بـێ زۆر لـێکردن ، وە لە دووەمیاندا (غیرُ مُختارٍ ولا مُریدٍ لــما وقع علیهِ) سەرپشك نـی‌یـە و ئـەوەی ناوێت کەوا کەوتووەتە سەری .

**وە وەڵامدانەوەی تاقمی دووەم (القدریة) بە شەرع و عەقڵ دەبێت :**

**لایـەنی شـەرع** : ئـەوا بەڕاسـتی خـوای گـەورە بەدیهێنـەر و دروسـتکاری هەموو شتێکە ، وە هەموو شتێك بە ویستی ئـەو دەبێـت ، وە خـوای گـەورە لـە کتێبەکەیـدا (قورئـان) روونـی کردووەتـەوە کـەوا کـرداری بەنـدەکان بـە ویـستی ئـەو ڕوودەدەن ، خـوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ ﴾ [البقرة] .

واتە : وە ئەگەر خوا ویستی لێ ببوایەت ئەوا ئەوانەی دوای ئەوان کوشتاریان نەدەکرد دوای ئەوەی کەوا بەڵگەی ڕوونیان بۆ هات بەڵام ئەوان جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە بۆیە هەندێکیان باوەڕی هێنا و هەندێکی تریان باوەڕی نەهێنا ، وە ئەگەر خوا ویستی لێ ببوایەت کوشتاریان نەدەکرد بەڵام خوا ئەوە دەکات کە دەیەوێت .

وە فەرموویەتی : ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ [السجدة] .

واتە : وە ئەگەر بمانەوێت ڕێڕەوی ڕووناکیمان (باوەڕهێنان) دەدا بە هەموو کەسێك ، بەڵام من بەڵێنی جێگیر و یەکلاییم داوە بەوەی کەوا دۆزەخ پڕ بکەمەوە بە جنۆکە و مرۆڤ هەموویان .

وە **لایەنی عەقڵ** : ئەوا بەڕاستی گەردوون هەمووی خوای گەورە خاوەنیەتی ، وە مرۆڤیش بەشێکە لەم گەردوونە ، وە مومکینیش نییە بۆ خاوەندار ڕەفتار بکات لە نێو موڵکی خاوەنەکەیدا ئیللا بە مۆڵەت (ئیزن) و ویستی خاوەنەکەی نەبێت .

# مەبەستەکانی بیروباوەڕی ئیسلامەتی

(أهداف العقيدة الإسلامية)

وشەی (الـــهدف) لە زمانی عەرەبیدا بۆ چەند واتایەك بە کار دەهێنرێت لەوانە : (نیشانە : جێگیر دەکرێت بۆ تێگرتنی ، وە هەموو شتێکی خواستراو) .

**مەبەستەکانی بیروباوەڕی ئیسلامەتی** : بریتین لە ئامانج و مەبەستە چاك و ڕێزدارەکان کە لە ئەنجامی پەیوەست بوون پێیەوە دەست دەکەون ، وە ئەو (**ئامانج و مەبەستانە**)ش زۆرن و جۆراوجۆرن ، لەوانە :

**یەکەم** : پاك کردنەوەی نییەت و پەرستن بۆ خوای گەورە بە تەنها ، چونکە ئەو دروستکارە و شەریکی نییە ، بۆیە پێویستە کەوا نییەت و پەرستن بۆ ئەو بێت بە تەنها .

**دووەم** : ئازاد کردنی عەقڵ و بیر لە بێسەروبەری و سەرلێتێکچوونی پەیدابوو لە نێو دڵی خاڵی لەم بیروباوەڕە ، چونکە هەر کەسێك دڵی خاڵی بوو لەێی ئەوە یان دڵی خاڵییە لە هەموو بیروباوەڕێك و تەنها کەرەستەی هەستپێکراو (مادەی بەرجەستە) دەپەرستێت ، وە یان سەری لێتێکچووە لە نێو گومڕایەتی بیروباوەڕە پووچ و ئەفسانەکاندا .

**سێیەم** : ئاسوودەیی دەرونی و بیری ، دەرونی هیچ هەست بە دوو دڵی ناکات و بیریشی شڵۆق نابێت و تێکناچێت ، چونکە ئەم بیروباوەڕە باوەڕدار پەیوەست دەکات بە دروستکار و بەدیهێنەرەکەیەوە ، بۆیە بە دروستکارەکەی ڕازی دەبێت کەوا ئەو پەروەردگار و بەڕێوەبەر و فەرمانڕەوە و بەرنامەدانەر ببێت بۆی ، ئەنجا دڵی ئارام دەگرێت بە قەدەری خوا و سنگی دەکرێتەوە بۆ ئیسلام و خوازیاری هیچ بەرنامەیەکی تر نابێت جگە لەو .

**چوارەم** : سەلامەتی و بێگەردی مەبەست و کردەوە لە لادان و لاڕێبوون لە پەرستنی خوای گەورەدا ، یان لە مامەڵە کردن لەگەڵ دروستکراوەکاندا ، چونکە یەکێك لە بنەماکانی ئەم بیروباوەڕە بریتی‌یە لە باوەڕبوون بە پێغەمبەران کە شوێنکەوتنی ڕێبازە سەلامەتەکەیان لە مەبەست و کردەوەدا دەگرێتەوە .

**پێنجەم** : یەکلایی و گورج بوون لە شتەکاندا ، بە شێوەیەك کەوا هیچ دەرفەتێك بۆ کردەوەی چاکە لە دەست نادات و ئیللا بە کاری دێنێت تێیدا بە ئومێدی پاداشت وەرگرتنەوە ، وە هیچ جێیەکی تاوان نابینێت ئیللا خۆیی لێ دوور دەخاتەوە لە ترسی سزا و تۆڵەی خوادا ، چونکە یەکێك لە بنەماکانی ئەم بیروباوەڕە بریتی‌یە لە باوەڕبوون بە زیندوو بوونەوە و پاداشت وەرگرتنەوە لەسەر کردەوەکان .

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوٓاْ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ [الأنعام] .

**واتە** : وە چەندین پلە هەیە بۆ هەریەکێکیان لە پاداشتی ئەوەدا کە کردوویانە ، وە پەروەردگارت بێئاگا نی‌یە لەوەی کە دەیکەن .

وە پێغەمبەر (ﷺ) هانی باوەڕدارانی داوە بۆ ئەم مەبەستە لەم فەرموودەیەیدا : «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ ، وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ ، احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلَا تَعْجِزْ ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلَا تَقُلْ : لَوْ أَنِّي فَعَلْت كَذَا كَانَ كَذَا وَكَذَا ، وَلَكِنْ قُلْ : قَدَّرَ اللَّهُ وَمَا شَاءَ اللَّهُ فَعَلَ ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ»[٢٣] .

---

[٢٣] رواه مسلم ، كتاب القدر ، باب في الأمر بالقوة وترك العجز والاستعانة بالله وتفويض المقادير لله ، رقم : (٦٧١٦) .

واتە : باوەڕداری بەهێز چاكترە و خۆشەویسترە لای خوا لە باوەڕداری بێهێز ، وە هەردووكیان هەر خێریان تێدایە ، سووربە لەسەر ئەوەی كە سوودی تێدایە بۆت و داوای یارمەتی لە خوا بكە و بێدەسەڵات مەبە ، وە ئەگەر ناخۆشی و بەڵایەكت تووش بوو ئەوا مەڵێ : "ئەگەر من ئاوام بكردایەت ئاوەها و ئاوەها دەبوو" ، بەڵكو بڵێ : خوا وای دانا بوو (قەدەری خوا وا بوو) وە خوا ویستی لە هەر شتێك ببێت دەیكات ، چونكە وتەی "ئەگەر ..." دەرگا دەكاتەوە بۆ كاری شەیتان .

**شەشەم** : پێكهاتنی ئوممەتێكی بە توانا و بەهێز كە هەموو شتێكی بە نرخ و كەم نرخ ببەخشێت لە پێناوی جێگیر كردنی ئاینەكەی و تۆكمە و بەهێز كردنی پایەكانیدا ، وە گوێنەدەر بەوەی كە تووشی دەبێت لە پێناوی ئەمەدا ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾ [الحجرات] .

واتە : بەڕاستی باوەڕداران تەنها بریتین لەوانەی كە باوەڕیان هێناوە بە خوا و پێغەمبەرەكەی و ئەنجا گومانیان نییە لەوەدا و تێكۆشاون بە ماڵ و خۆیانەوە لە پێناوی خوادا ، ئا ئەوانە بریتین لە ڕاستگۆیان .

**هەوتەم** : گەیشتن بە بەختەوەری دونیا و دوارۆژ بە چاك كردنی تاكەكان و كۆمەڵەكان ، وە دەست خستنی پاداشت و ڕێزەكان لای خوا ، وە سەبارەت بەمە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾﴾ [النحل] .

واتە : هەر كەسێك كردەوەی چاكە ئەنجامبدات چ نێر یاخود مێ بێت و باوەڕدار بێت ئەوا بەدڵنیایی ژیانێكی خۆش و بەلەزەتی بۆ دەرەخسێنین لە دونیادا ، وە بەدڵنیایی لە دواڕۆژیشدا پاداشتیان دەدەینەوە بە باشتر لەوەی كە كردوویانە .

ئەمانە هەندێك بوون لە **مەبەستەكانی بیروباوەڕی ئیسلامەتی** ... ئومێدەوارین لە خوای گەورە كە بۆ ئێمە و هەموو موسڵمانانی بە دی بێنێت ، بەڕاستی خوا دەستكراوە و بەخشندەیە ، وە سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهان .

وصلّى اللهُ وسلَّمَ على نبيِّنا مُحَمَّدٍ
وعلى آلهِ وصحبهِ أجمعين

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار تەواو بووم لە وەرگێڕانی ئەم كتێبە زۆر بەسوودە لە ڕۆژی سێ شەمەی مانگی موحەڕەمی پاش هەزار و چوارسەد و سی ساڵ لە كۆچ كردنی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لە مەككەوە بۆ مەدینە كە دەكاتە بەرواری : (١٠ / ١ / ١٤٣٠) كۆچی .

وەرگێڕ
**محمد عبد الرحمن لطيف**
**پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی ( شێخ إبراهيم )**
كوردستان / كەلار : (٠٧٧٠١٩٨٨٦٢٣)

# ناوەڕۆك

(اللهُمَّ اجعلْ خيرَ عمري آخرهُ ،
وخيـــر أعمالـــي خواتِـــمَهُ ،
وخيـــرَ أيامـــي يوم ألقـــاك)

# لە بەرهەمەکانی وەرگێڕ

١ ـ سێ بنچینەکەی بیروباوەڕ و بەڵگەکانیان ـ چاپی چوارەم ـ .

٢ ـ بیروباوەڕت وەربگرە لە قورئان و سوننەت ـ چاپی دەیەم ـ .

٣ ـ پوختەیەك لە بیروباوەڕی ئیسلامەتی ـ چاپی چوارەم ـ .

٤ ـ کورتەیەك لە فیقهی سوننەت و قورئانی ئازیز ، لە بریتییە لە وەرگێڕانی کتێبی : (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ـ ئامادە دەکرێت بۆ چاپ ـ .

٥ ـ برایەتی نێوان موسڵمانان .... ـ چاپی چوارەم ـ .

٦ ـ لەگەڵ کێدا دادەنیشیت و هاوڕێیەتی کێ دەکەیت ؟ ـ چاپی حەوتەم ـ .

٧ ـ چۆنێتی قوربانی کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ـ چاپی چوارەم ـ .

٨ ـ کاتی پارشێو و بەربانگ کردن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ)ـ چاپی چوارەم ـ .

٩ ـ حوکم و ئادابەکانی قەرزدان و قەرزکردن و قەرزدانەوە .... ـ چاپی یەکەم ـ .

١٠ ـ فەتوای گەورە زانایانی هاوچەرخی ئەهلی سوننە و جەماعە سەبارەت بە حوکمی حزبایەتی و جیاوازی و پارچە پارچەگەرێتی ـ چاپی دووەم ـ .

١١ ـ گەڕانەوە بۆ لای زانایانی ئەهلی سوننە پارێزەرە لە تیاچوون و گومڕابوون ـ چاپی یەکەم ـ .

١٢ ـ لە ئیسلامدا چەندین گروپ و حیزب نییە بەڵکو کۆمەڵی موسڵمانان و خەلیفە هەیە ـ چاپی یەکەم ـ .

١٣ ـ حوکمی کۆمەڵ و حزبە ئیسلامییەکان لە نێو کۆمەڵگای موسڵمانانندا / فەتوای هەردوو شێخ : (ابن باز) و (ابن العثيمين) ـ چاپی یەکەم ـ .

١٤ ـ زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا :

یەکەم : ئافرەتان و فێربوونی زانستی شەرعی ـ چاپی شەشەم ـ .

دووەم : زانا ترین ئافرەتی دونیا ـ چاپی شەشەم ـ .

سێیەم : لە دایك بوونی کچان و سەرهەڵدانەوەی خەصڵەتێکی سەردەمی نەفامی و جاهلی لە سەدەی پێشکەوتووی بیست و یەکدا !!! ـ چاپی پێنجەم ـ .

١٥ ـ ئایا لەم دەرگایەت داوە ؟ (پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار) ـ چاپی چوارەم ـ .

